عەزیز گەردی

# رەوانبێژی

## لە ئەدەبی کوردی دا

بەرگی دووەم

## جوانکاری

وەزارەتی راگەیاندن - بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری کوردی - بڵاویدەی داوە

بەلاغەتێکی هەیە هیچ زمانێ نایکاتێ
لە بێ تعصبی کوردانە بێ رەواج و بەها
« حاجی »

# رەوانـــبێژی

## لە ئەدەبی کوردی دا

### بەرگی دووەم

### جوانکاری ـ البدیع ـ


عەزیز گەردی



چاپخانەی شارەوانی — هــەولێر — ١٩٧٥

وەزارەتی راگەیاندن ـ بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری کوردی ـ یاریدەی داوە

# پێشەکی

خوێنەری ئازیز!

سالی ١٩٧٢ بەرگی یەکەمی ئـــەم کتێبەم پێشکەش کردی ، کە [ ڕوونبێژی ]یە گفتیشم پێ دای هەرکاتێ دەرفەتم بوو بـەرگی دووەم و سێ بەمیشت باونەبە بەردەست ، خۆ دیاریشە تەنگ و چەڵەمەی چاپـەمەنی کوردی ئەوەندە زۆرە پیاو لەژێریا دەڕزێتەوە.. بەلام هەرچی و چۆنێك بێ وا ئەم جارەش خۆم هاویشتە بەر چەرخی خەم و ئەشکەنجەو ئازارەوە بۆ ئەوەی بەرگی دوو.مت بخەمە بەردەست..

لێرەدا دەمەوێ ئەم ڕاستییەش وەبیر بێنمەوە کە [ ڕەوانبێژی ] بە هەرسێ بەشییەوە ؛ بەرهەمی ڕەنجی دوو سالی ڕەبەقە ، سالی [ ١٩٦٨ — ١٩٦٩ ] کە توانیم لە ماوەی ئەم دوو سالەدا ئەم نوسینە ئامادە بکەم ، بەلام لەبەر گرانی ئەرکی چاپەمەنی و ئەو کەند و لەند و کۆسپ و تەگەرانەی دێنە سەر ڕێی ئەو کەسەی کتێب چاپ دەکا ، چاپ کردنی کتێبەکە وا پچڕ پچڕ بوو و دواش کەوت ، نەك هەر دوا کەوت و بەس بگرە بارگرانی چاپ کردن ناچاری کردم کە هەموو بەشەکان دووجار و سێجار کورت و خەست کەمەوە ؛ تا لەئەنجامدا ئەم دەردەی بەسەرهات کە خۆت دەیبینی و هەستی پێ دەکەی!! هەر بۆیەشە نابێ ئەم بەشانە بە جودا جودا بدرێنە قەلەم ، چونکە هەموویان تەواوکەری یەکترن و پێکەوە ڕێ و شوێنی زانیارییەك ڕوون دەکەنەوەو لێکی دەدەنەوە کە تا ئێستا لە کوردیدا بایەخێکی وای پێ نەدراوەو شوێنەکەی هەر بە بۆشی بەجێ ماوە..

ئیتر ئومێدەوارم ئـەم کتێبە جێی خۆی بگرێت و خوێنەرە دلسۆز و ڕاستەقینەکانی کورد زمان بە سینگێکی فراوانەوە وەری بگرن و هەرچی

کەم و کورتی هەیە لەسەری بازنەدەن و بیخەنە بەرچاوانەوە، چونکە دیارە ئیمە لە ئۆناغی ئیستاماندا زیاد لە هەموو کات و سەردەمێکی تر پێویستمان بە رەخنەگرێکی بەویژدان و بێلایەن و رەخنەوەرگرێکی سنگ فراوان هەیە بۆ ئەوەی بتوانین تەکانێك بە ئەدەبەکەمان بدەین و ئۆناغ بە ئۆناغ پێشی بخەین ، ئیتر ئێوە و ئەم بەشە و رای خۆتان و سوپاس..

عەزیز گەردی

هەولێر — ١٥/٧/١٩٧٣

# ـ جوانکاری ـ

راستی‌یەك هەیە هیچ گومانی لێ ناکرێ ئەویش ئەوەیە؛ هەر نەتەوەیێك خاوەنی ڕەوانبێژی خۆیەتی کە لە ناخی زمانەکەیەوە هەڵقولاوە و مۆرکی تایبەتی ئەوی پێوە لکاوە ، ڕەوانبێژی بەلای هەرنەتەوەیەك‌و لەهەر زمان‌و ئەدەبێکەوە دەکرێتە سێ بەش :ـ

١ـ ڕوونبێژی [ البیـان ]

٢ـ جوانکاری [ البدیع ]

٣ـ واتاناسی [ علم المعاني ]

ئێمە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەمان بۆ [ ڕوونبێژی ] تەرخان کرد و ئەم بەرگەش بۆ بەشی دووەم تەرخان دەکەین کە [ جوانکاری ] یە ،

[ جوانکاری ] بەشێوەیەکی گشتی لەو ڕەگەزو دەستوورانە دەدوێ کە لایەنی هونەری‌و جوانی ئەدەب ڕوون دەکەنەوە، ئەویش دوو لایەنی هەیە یا دوو جۆرە هونەرنواندنی جوانکارانە هەیە :ـ

١ـ جۆری یەکەم تایبەتی‌یە بەلایەنی ڕوخسارو شێوەی ئەدەبی‌یەوە.

٢ـ جۆری دووەم لەو جوانی‌یە دەدوێ کە لەناخی ناوەرۆکی بەرهەمی ئەدەبی‌یەوە هەڵدەقوڵێ و دونیای ئەدەبەکە دەڕازێنێتەوە..

لەم بەرگەدا بە دوور و درێژی باسی ئەم دوو لایەنە دەکەین و یەکە یەکە لێ‌یان دەکۆڵینەوە و ڕوونیان دەکەینەوە.. لەبەشی یەکەم دا قسە لە جوانکاری ڕوخساری ئەدەب دەکەین و جۆرەکانی دەردەخەین‌و نموونەیان بۆ دێنینەوە.. لە بەشی دووەمیش دا باسێکی جوانکاری ناوەرۆکی ئەدەب دەکەین و هەموو جۆرەکانی دێنینە گۆڕێ و بەپێی توانا‌و دەرفەت لێ‌یان دەدوێین و بەڵگەیان بۆ دێنین...

# بەشی یەکەم

* ڕەگەزدۆزی [ الجناس ]
* سەرواداز [ السجع ]
* کەرت کردن [ التشطیر ]
* گێڕانەوە [ الترديد ]
* هێنانەوە [ التصدير ]
* پات کردنەوە [ التكرار ]
* تێهەڵکێش [ التضمين ]
* پێنج خشتەکی [ التخميس ]

# ڕەگەزدۆزی :

ڕەگەزدۆزی [ الجناس ] : ئەوەیە کە دوو ووشە یا پتر بێنی ، لە ڕواڵەت دا وەکو یەك وابن یا بەیەك بچن . بەلام هەر یەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەبێت کە جودابێ لە واتای ووشەکانی تر . پیرەمێرد دەڵێ :—

بە شەدەی لاژ و کراسی کەتان
وەك مانگ ( کەتان ) ی جەرگیان ئەسووتان

ووشەی ( کەتان ) دوو جار هاتووە ، هەردووکیان لە ڕواڵەت دا یەك شتن بەلام لە بارەی ماناوە ، هەریەکە واتاو گوزارەیەکی تایبەتی هەیە ، یەکەمیان جۆرە قوماشێکە ، دووەمیان جۆرە گولێکی جوانە لە بەهاران دا لە دەشت و دەرا دەڕوێ و دەڵێن کە تریفەی مانگی لێ دەدا دادەفرەتێ و گەڵاکانی هەڵدەوەرێن .

ڕەگەزدۆزی دوو جۆرە :—

یەکەم : ڕەگەزدۆزی تەواو [ الجناس التام ]
دووەم : ڕەگەزدۆزی ناتەواو [ الجناس غیر التام ]

یەکەم : ڕەگەزدۆزی تەواو :—

ڕەگەزدۆزی تەواو ئەوەیە کە هۆنەر یا نووسەر دوو سێ ووشەی وا بێنێ کە لە ڕواڵەت دا کت ومت وەك یەك وابن و بە ئەندازەی موویەك جیاوازیان نەبێت ، بەلام لەگەل ئەوەش دا هەریەکەیان واتای تایبەتی خۆی هەبێت واتایان جودا و ڕواڵەتیان یەك بێ .

کە گوتمان ئەو ووشـــانەی ڕەگەزدۆزییان لێ دەکەوێتەوە دەبێ لە ڕواڵەت و دیمەن دا وەکو یەك بن ، مەبەست ئەوەیە لەم نیشانەی خوارەوە یەك بگرنەوە :—

أ- ژمارەی پیتەکان : ئەو ووشانەی رەگەزدۆزی تەواویان لێ دەکەوێتەوە دەبێ هەموویان ژمارەی پیتەکانیان هەندی یەك بێت ، وەك ئەوەی هـەر یەکەیان لە سێ پیت یا لە چوار پیت یا.... پێنك هاتبێ.

ب- جۆری پیتەکان : کە ووشەکان ژمارەی پیتەکانیان یەك بوو دەبێ جۆری پیتەکانیشیان یەك بێت ، بۆ نموونە لەو نموونەی سەرەوە کە هێنامان ووشەی ( کەتان ) کە دوو جار هاتووە و هەر جارەی مانایەك دەدات ، ئەمە رەگەزدۆزی تەواوەو لەم دوو ووشەیەدا یا لەم ووشەیەدا کە دوو جار هاتووە ، لە هەر دوو لادا ووشەکە لە [ ٥ ] پیت پێك هاتووە و جۆری پیتەکانیش لە هەردووکیاندا یەك شتە ، هەردوو ووشەکان لە پیتەکانی [ ك. ە. ت. ا. ن. ] پێك هاتوون.

ج- شێوەی پیتەکان : مەبەست تەڵەوی و لاوازی ، یا کرانەوەو نەکرانەوەی ووشەکانە کە بە نیشانەی [٧] لێك دادەبڕین(١) .. و دەبێ هەموو ئـەو ووشانەی رەگەزدۆزیان لێ کەوتۆتەوە لەم بارەیەوە وەك یەك وابن.

د- ریزی پیتەکان : دەبی ریزی پیتەکانی ئەو دوو ووشەیەی دەکەونە بەر رەگەزدۆزی تەواو یەك بێ ، لەپێشەوە نموونەیەکمان هێنا ، دوو جار ووشەی ( کەتان ) هاتبوو ، لە هەردووکیان دا ریزی پیتەکان بەم جۆرەیە: [ ك. ە. ت. ا. ن. ] ، نابێ پیتەکانی دوو ووشەکە پاش و پێش بکرێن ئەگینا نابێتە رەگەزدۆزی تەواو.

---

(١) لە عەرەبیدا سەرو بۆرو ژێر دەکرێتەوە ، بەڵام چونکە بەلای منەوە سەرو بۆرو ژێر لەکوردیدا نییە و ئەوانیش هەر پیتی سەربەخۆیان هەیە دەنگەکەیان دەردەبڕێ و لەبەر ئەوەی نیشانەی [٧] لەکوردیدا دەبێ بەهۆی دەست نیشان کردنی هەندێ خەسیەتی دەنگیو بەمەوەش مانای ووشەکە تا رادەیەکی زۆر دەگۆڕێ ، ئەم نیشانەیەمان لەجیاتی سەرو بۆرو ژێری عەرەبی بە مەرجێکی رەگەزدۆزی تەواو دانا.

نموونەیەك : حاجی دەڵێ :ـــ

بۆ تەماشای بەڵەك و کوڵمی سپی و چاوی بەڵەك
نیشتووە لەم دەرە عاشق وەکو حاجی لەك لەك

لە نیوەی یەکەم [ حاجی ] دوو ووشەی هێناوە، هەردووکیان لەدیمەن و ڕواڵەتدا یەکن ، وا هەست دەکەی یەك ووشەیەو دووپات بۆتەوە، بەلام ئەگەر لێیان وورد ببینەوە دەبینین هەریەکەیان واتایەکی تایبەتی و سەربەخۆی هەیە.. ئەوانیش هەردووکیان ووشەی [ بەڵەك ] ن ، کە ووشەی یەکەم بە مانای پووز هاتووەو ووشەی دووەمیش خاسەوژێکی چاوە ، ئەو چاوەی ڕەشەکەی زۆر ڕەش و سپێنەی زۆر سپی بێت.

ئەم دوو ووشەیە [ بەڵەك ] [ بەڵەك ] بەر ڕەگەزدۆزی تەواو دەکەون ، بۆیەش بەری دەکەون چونکە هەر چوار مەرجەکەی سەرەوەیان لێ هاتۆتە دی.. ژمارەی پیتەکانیان هەندی یەکە کە هەریەکەیان لە پێنج پیت پێك هاتووە ، جۆری پیتەکانیشیان یەکە کە لە هەردووکیاندا ئەمانەن : [ ب. ە. ل. ە. ك. ] ، شێوەی پیتەکانیش یەکە چونکە لە هەردووکیاندا پیتی [ڵ] تەڵەوەو [٧]ێکی چۆتە سەر.. دواجار ریزی پیتەکانیشیان هەر وەکو یەکە، واتە زنجیرەی ریزبوونی پیتەکان لەهەر دوو ووشەدا یەك شتە؛

لە هەردوو ووشەدا یەکەم پیت [ب] و دووەم [ە] و سێیەم [ڵ] و چوارەم [ە] و پێنجەم [ك] ە.

## بەشەکانی ڕەگەزدۆزی تەواو

ڕەگەزدۆزی تەواو چوار جۆری هەیە :ـــ

١ـ ڕەگەزدۆزی هاوڕەسەن      ٢ـ ڕەگەزدۆزی تەبا
٣ـ ڕەگەزدۆزی ئاوێتە      ٤ـ ڕەگەزدۆزی ساوێتە

## ١ـ رەگەزدۆزی هاوڕەسەن :ـــ

ئەوەیە کە هەموو ئەو ووشانەی دەکەونە بەر رەگەزدۆزی هاوڕەسەن بن ، واتە لەیەك رەسەن و رەگەز دابن وەك ئەوەی هەموویان [ ناو ] بن یا هەموویان [ کردار ] بن.

أـ وا دەبێ هەموویان [ ناو ] بن وەکو نالی دەڵێ :ـــ

دونیا کە گوڵ گوڵی بووە قوربان ئەتۆش وەرە
طالب بە گوڵ بە قەیدی چییە گوڵ گوڵی بوێ

سا ، سای بەهارە ، سروشت بە نەرم و هێمنی ، بەڕێك و پێکی گوڵ و گوڵاڵە و حاجیلەو هەلالەی دەرکردووە ، بۆنێکی وا بلاو دەکاتەوە هوشیار مەست و بێدار سەرخۆش دەکا ، نالی لەو دەمە دەمی بەهارە ، تاچـارە روو لە یارە ناسکۆڵەکەی بکات و پێی بڵێت : ئێستا کە بەهارەو دونیا رەنگاو رەنگ و گوڵ گوڵی بووە ، تۆش ئەی یارە نازدارەکەم ، ئەی گوڵە گەشاوەکەم وەرە بفەرموو سەیرێکی ئەم گوڵزار و بەهـارە بکە و داوای گوڵێکی ئەم بەهارە بکە. بەس لاف و گەزاف بەوە ئەبدە کە خۆت گوڵیت ئێمە هەموومان ئەوەمان سەلماندووە کە گوڵیت و گوڵێکی تاقانەشیت بەلام ئەیدی چییە ئەگەر گوڵێکی تەڕ و پاراوی وەك تۆ ناسك و نازدار بێت و گوڵی بەهاری بوێ ، خۆ تۆ بەم گوڵویستنە لە گوڵایەتی خۆت ناکەویت؟

لێرەدا کە ووشەی [ گوڵ ] دوو جار هاتووە ، ئەوەمان یـاد دەخاتەوە کە دوو گوڵ هەبن و ئەم دوو گوڵە لەسەر دوو چلا بە دیار یەکەوە وەستابن و بە دەم گزەباوە ووردە ووردە سەر بۆ یەکتر لار بکەنەوە بەلام لەراستیدا وانییە ، ئەم دوو ووشەیە هەر یەکەیان مانایەکمان دەداتێ ، یەکەمیان بۆ دڵخواز خوازراوە ، ئەوەی تریشیان گوڵی بەهارە ئەوانەش هەر دووکیان [ ناو ] ن ، کە هەردووکیش ناوبوون مانای وایە رەگەزدۆزی هاوڕەسەنن.

ب ـ وا دەبێ کە هەموو ووشەکان کرداربن. پیرەمێرد دەڵێ :ـــ

بەوە چاك ئەبی چاکی بنوێنی
نەك بە خەمەوە خەڵکی بنوێنی

ووشەی [ بنوێنی ] دووجار هاتووە ، هەر جارەی واتایەك دەبەخشی ، یەکەمیان مانای [ پێشان دەدات ] دەگەیەنێ [ چاکی بنوێنی ] واتە چاکە بکەیت و چاکە پێشان بدەی. دووەمیــش مانای نواندن دەگەیـەنێ کە لەنووستنەوە هاتووە. [ خەڵکی بنوێنی ] واتە : بیانخەیتە خەوەوە.. ئەمانەش هەردووکیان لە رەسەنێکن ، هەردووکیان [ کردارن ]. بۆیە ئـــەمەش [ رەگەزدۆزی هاورەسەن ] ـە.

## ٢ـ رەگەزدۆزی تەبا :ـــ

ئەوەش وا دەبێ دوو ووشە بێن هەردووکیان رەگەزدۆزی تەواویان لێ بکەویتەوەو هەردووکیشیان لە رەگەزو رەسەندا لەیەك جیابن ، یەکێکیان [ ناو ] و ئەوی دیکەیان [ کردار ] بێت ، بۆیەش پێی دەڵێن [ تـەبـا ] چونکە لەگەڵ ئەوەی رەسەنیشیان جودایە لە رواڵەت دا یەك شتن و زۆر لەگەڵ یەکتردا تەبان. کاکەی فەللاح دەڵێ :ـــ

ئەو بوو لە چەرخی بیستەما        شـلبازی سەرلقی هەڵبەست
لە کێوی سەخـتی ســـتەما        قەڵای شیعری تازەی هەڵبەست

[ هەڵبەست ] ی یەکەم ناوە مانای [ هۆنراوە ـ شیعر ] دەدات ، [ هەڵبەست ] ی دووەم کردارە مانای دامەزرانـدن و بنیات نان دەدات ، دیارە ناوێك و کردارێك پێکەوە رەگەزدۆزییان دروست کردووە ، ئەمەش رەگەزدۆزی [ تەبا ] ی پێ دەڵێن. ، مەلا محمدی کۆیی دەڵێ :ـــ

ئەوەی رێگای لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خوا لە ئەلحـــەد و گۆڕی

[ گۆڕی ] ی یەکەم کردارە ، مانای رێ لەبەر بزر کردن و هەڵەتە کردن

دەکەیەنی ، [ کۆڕی ] ی دووەم ناوە ، واتە تەبری ئـەو کەسەی کە ڕێی لە کوردان کۆڕی. یەکەم کردارە ، دووەم ناوە ، ڕەگەزدۆزی نێوان ناوێكو کردارێك یا کردارێكو ناوێك پێی دەگوترێ [ڕەگەزدۆزی تەبا].

## ٣ـ ڕەگەزدۆزی ئاوێتە :ـــ

ئەوەیە کە ئەو هەردوو ووشەی ڕەگەزدۆزییان ل‌ێدەکەوێتەوە ، ووشەی لێکدراو بن واتە سادە نەبنو هەریەکەیان لە چەند ووشەیەکی سادە ، یا لە ووشەیەکی سادەو پارچەیەکی ووشەیەکی دی پێك هاتبێ ، لێرەدا سەیری ئەوە ناکرێ ئاخۆ دوو ووشەکە ناون یا کردارن ، بەڵکو هەر سەیری ئەوە دەکرێ کە ووشەی لێکدراونو بەس. کاکەی ئەللاح دەڵێ :ـــ

ملی ڕێ بگرەو برۆ بەرزی　　یا سەرداری‌یە یا سەرداری‌یە

[ سەردار ] ووشەیـەکی لێکدراوەو دوو ووشەی سادە [ سەر ، دار ] خۆیان لێك داوەو دروستیان کردووە.. ئەم ووشە لێکدراوە دووجار هاتووە جارێکیان مانای پیاوی گەورەو پێشەوا دەکەیەنێو جارێکیش مانای چوونە سەر داری تەنارە.. ئەم جۆرە ڕەگەزدۆزی‌یەش [ ڕەگەزدۆزی ئاوێتە ] ی دەبێژن.

ڕەگەزدۆزی ئاوێتە دوو جۆرە :ـــ

أـ ئەوەیە هەردوو ووشەکە ئاوێتە بن و لە شێوەی نووسینیش دا یەك بن و جیاوازی‌یان نەبێ. زیوەر دەڵێ :ـــ

با نەچێتە لای ڕەقیبان یار ئەنیـسی خانـەبێ
لازمە ئەو ئاسکە لەولا نەبێ لەو لانـــە بێ

ڕەگەزدۆزی لە [ لەولانەبێ ] دایە.. زیوەر دەڵێ با یـارە ئاسکۆلەکەم نەچێتە لای دووژمان و ناحەزو قسە چنانەوە بەڵکو هەر مترووی ماڵەوەبێو پێ لە کۆسپەی ئاوا نەکا.. [ لەولا نەبێ ] واتە لەلای ڕەقیب و ناحەزان

نەبێ : [ لەولانەبێ ] ی دووەم واتە لەم هێلانەیە بێ کە ماڵەوەیە : هەردوو [ لەولانەبێ ] ش کە کەوتوونەتە بەر سێبەری رەگەزدۆزیەوە شێوەی نووسینەوەیان یەك شتەو مانایان جودایە . . .

ب- ئەوەیە کە هەردوو ووشەکە ئاوێتە بێ و لە خوێندنەوەدا وەك یەك بێ بەڵام لە شێوەی نووسیندا جیابێ و هەریەکە بە جۆرێك بنووسرێ . زیوەر دەڵێ : عارف حەق بێ چە باکی زینەت و ئارایشە

وای ئەوێ ناو شار و دێ وانەبێ دێوانە بێ

دەڵێ : پیاوی ووردبین و راست پەرست ، پیاوی زاناو هوشیار ، لە بەر لێکدانەوەو ووردبوونەوە زوو بەراستەقینە دەگات و کە لەراستیش گەیشت هیچ باکی بە رازاندنەوە و ئارایش دان نییە ، وای دەوێ کە خەڵکی تێکرا لە شارو دیهاتەکاندا وانەبێ ، واتە رازاوە و بەخۆدا هاتوو نەبێ ، بەڵکو دێوانەو قەلەندەربێ . . رەگەزدۆزی لە [ دێ وانەبێ ] و [ دێوانەبێ ] کەوتۆتەوە . . یەکەمیان لە [ دێ ، وا ، نەبێ ] و دووەمیان لە [ دێوانە ، بێ ] دروست بووە . . ئەمانەش لە خوێندنەوە و قسەکردن دا وەکو یەك وان ، بەڵام شێوەی نووسینیان جودایە .

## ٤- رەگەزدۆزی ساوێتە :

ئەوەیە نووسەر یا هۆنەر دوو ووشە بێنێ ، ئەم دوو ووشەیە لەرواڵەتدا وەکو یەك بێ و هەریەکە واتای تایبەتی خۆی هەبێت و یەکێکیان ووشەیەکی سادەو ئەوەی تریان لێکدراوبێت . . حاجی قادری کۆیی دەڵێ :-

زۆر سەگم دیوە فقط ئەمدی رەقیبی هەندەسە

وەزعی ناموزون دەبێ وەك خانووی بێ هەندەسە

حاجی قادر دووجار ووشەی [ هەندەسە ] ی هێناوە ، هەرجارە کردوویە بەکالای گوزارەیەك دا . یەکەمیان لەدوو ووشەی سادە پێك هاتووە [ هەندە ،

سە ] واتە ئەوەندە سەك.. دووەمیشیان لە یەك ووشەی سادە پێك هاتووە [ هەندەسە ] كە لقێكە لە لقەكانی زانیاری.

أ- ئەوەیە كە دوو ووشە بێن ، یەكێكیان سادەو ئەویكەیان لێكدراو بێت، لێكدراوەكە بریتی بێ لەچەند ووشەیەكی سادە یا ووشەیەكی سادەو پاژەی ووشەیەكی‌تر.. دەبێ ئەم دوو ووشەیەش كە رەگەزدۆزی‌یان ان‌كەوتۆتەوە لە شێوەی نووسین‌دا وەكو یەك وابن. حاجی قادر دەڵێ :—

سەد وەكو رۆستەم بەدڵ قەمچی لەرەخشی‌دا ، بـەزی
وەك كەیشتە خەندەكی دوامێـــنی عومری دابـــەزی

[ دابەزی ] دووجار هاتووە ، هەریەكە واتایەكی تایەتی دەبەخشێ ، یەكەمیان لە ووشەیەكی سادە [ پەزی ] - واتە شكا و كۆڵی دا - لەگەڵ پاژەیەكی ووشەی پێشەوە [ دا ] پێك هاتووە.. دووەمیـــشیان ووشەیەكی سادەیە [ دابەزی ] واتە هاتە خوارەوە. لێرە بەووشـــەیەكی سادەو پاژەی ووشەیەكی‌تر لەنگەری رەگەزدۆزی بۆ ووشەیەكی سادە رادەكرن.

ب- ئەوەیە دوو ووشە بێن یەكێكیان سادەو ئەویتریان لێكدراو بێت ، جا ووشە لێكدراوەكە لە چەند ووشەیەكی ســادە پێك هاتبێ یا بریتی بێ لە ووشەیەكی سادە و پاژەی ووشەیەكی تر.. وە ئەم دوو ووشـــەیەش كە رەگەزدۆزی‌یان ان‌كەوتۆتەوە لەشێوەی نووسینیانەوە جودابن، واتە هەریەك بە جۆرێك بنووسرێ ، مەولەوی دەڵێ :—

بكیـانـە پەیكێ وەپارانەوە پەی كێ؟ پەی مەجنون بیارانەوە
مایەی بێ مەیلت بشارانەوە یا بلست ئەشۆ بەشـارانەوە (١)

واتە : بە لالانەوەو پاڕانەوە نامەیەك یا راسپێرێك بنێرە. بۆ كێ ؟ بـۆ

(١) بكیانە : بنێرە ، پەیك : نامە یاخود راسپێر ، بیارانەوە : بكێڕنەوە بشارانەوە : بشارنەوە ، ئەشۆ : ئەڕوا ، پەی : بۆ.

مەجنون، نامەیەك بۆ مەجنوونی شێت و شێدا بنێرن. ـتۆش مایەی ساردیو بێمەیلی خۆت بشارەوەو داپۆشە، نەبادا ناوت لەناو ناوانەوە بزڕێو لزمەو سەرزەنشت بکرێی. [ پەیکێ ] جاری یەکەم ، مانای نامە یا راسپێر دەدات ، ووشەیەکی سادەیە . [ پەی ، کێ ] لە دوو ووشە پێك هاتووە واتە [ بۆ کێ ] بەم جۆرە رەگەزدۆزی بال بە سەر ئەم دوو ووشەیە دا دەکێشێ [ پەیکێ ] و [ پەی کێ ] کە یەکەمیان لە یەك ووشەو دووەمیان لە دوو ووشەی سادە پێك هاتووە. جگە لەمەش شێوەی نووسینیان جودایە.

## دووەم: رەگەزدۆزی ناتەواو :

لەپێشەوە گوتمان رەگەزدۆزی تەواو ئەوەیە دوو ووشە یا پتر لەم چوار شتە وەکو یەك بێو مانایان جودابێ :—

* ژمارەی پیتەکان
* جۆری پیتەکان
* شێوەی پیتەکان
* ریزی پیتەکان

جا ئەگەر بێتو دوو ووشەکە لە یەکێ لەم چوار شتە یەك نەبن و لە هەرسێکەکەی تر یەکبن ئەو حەلە رەگەزدۆزی ناتەواو دروست دەبێ چونکە بەتەواوی هەر چوار مەرجی لێ نەهاتۆتە دی. وا دەبێ ژمارەی پیتەکانیان ئەوەندەی یەکتر نابێ یەکێکیان پیتێك یا دوو پیت لەوەی تر پتر بێ ئەوەش پێی دەگوترێ **رەگەزدۆزی زیاد**. یا وادەبێ جۆری پیتەکانیان جودا بێ ، واتە یەك پیتیان یەك نەبێت و جیابێ ئەوەش پێی دەگوترێ **رەگەزدۆزی جودا**. یا وادەبێ شێوەی پیتی ووشەکان یەك نەبێ لەبارەی هەبوونو نەبوونی نیشانە [٧] کە بۆ تەڵەویو لاوازی یا بـ کرانەوەو نەکرانەوەی هەندێ دەنگ دەخرێتە سەر هەندێ پیتەوە ، بەوەش دەڵێن **رەگەزدۆزی لار**. یاخود وارێدەکەوێ هەردوو ووشەکە ریزی پیتەکانیان جودا بێ وەك ئەوەی پیتەکان پاش و پێش کرابێ ، ئـەوەش

## ـ ڕەگەزدۆزی ئاڵۆز ـ..

خۆ ئەگەر دوو ووشە هاتن لەم چوار مەرجە دووانیان تیا هاتە دی و دووانیان تیا نەهاتەدی ئەو حەلە ڕەگەزدۆزی دروست نابێ ، تەنیا ئەوکاتە ڕەگەزدۆزی ناتەواو دەبێ کە سێ مەرج لەو مەرجانەی سەرەوە هەبێ و تەنیا یەك مەرج نەهاتبێتە دی.

جا ئێستا یەکە یەکە لەگەڵ ئەم چوار جۆرە ڕەگەزدۆزی‌یە پێدا دەچین‌و بەپێی توانا لێیان دەدوێین و ڕوونیان دەکەینەوەو نموونەیان بۆ دێنین :ـ

### یەکەم : ڕەگەزدۆزی زیاد :(۱)

ڕەگەزدۆزی زیاد ئەوەیە ئەم دوو ووشەیەی کەوتوونەتە بەر کاریگەری ڕەگەزدۆزی جۆرو شێوەو ڕیزی پیتەکانیان یەك بێ بەلام ژمارەی پیتەکانیان ئەوەندەی یەکتر نەبێ ، یەکێکیان پیتێك یا دوو پیت لەوەیتر پتر بێت ، هەر لەبەر ئەمەشە پێی دەگوترێ ڕەگەزدۆزی زیاد. نالی دەڵێ :ـــ

من لە بێبەرگی [ عە ] م پرسی کە بۆچ ڕووتی ووتی
یارەبی شێت بم ئەگەر شـــاد بم بە بەرگی عاری‌یە

ووشە [ ڕووتی ] و [ ووتی ] ڕەگەزدۆزی‌یان لێ کەوتۆتەوە ، ئـــەم دوو ووشەیە ژمارەی پیتەکانیان جودایە ، ووشەی [ ڕووتی ] پیتی [ ر ]ی پترە لە ووشەی [ ووتی ] ، ئەم پیتە پترەش لەسەرەتای ووشەی یەکەمەوە هاتووە

---

(۱) لەعەرەبی‌دا بەم جۆرە ڕەگەزدۆزی‌یە دەڵێن ـ الجناس الناقص ـ واتە بەناوی ئەم ووشەیەوە کە ژمارەی پیتەکانی کەمترە لەوی ترەوە ناونراوە.. بەلام من وام بەپەسند زانی کە بەناوی ووشە زیادەکە ناوی بەرین.. چونکە ئێمە هەمیشە حیسابی پیتە زیادەکان دەکەین ، ئاخۆ چەند پیت زیادە و پیتە زیادەکان کەوتوونەتە کوێ ، بۆیە چاکتر وایە ڕەگەزدۆزی‌یەکەش هەر بەناوی ئەوەوە بێ .

— رەگەزدۆزی زیاد دوو جۆرە —

١ـ ئەوەیە کە جیاوازی دوو ووشەکە لە یەك پیت بێت و بەس ، واتە ووشەیەکیان تەنیا یەك پیت لە ووشەکەی تر پتر بێت ، ئەم پیتە زیادەش لە سێ شوێندا دەردەکەوێ :—

أـ لە سەرەتای ووشەیەکەوە ، نالی دەڵێ :—

لەنێو ڕێگەی ڕەوانی قوم نقوم بوو ووشتر بوو گوم
ئەما گوێ بیبێ قوم قوم چە جای نیمکانی هەستانە

رەگەزدۆزی لە نیوەی یەکەم لە بەینی [ قوم ] و [ نقوم ] دایە . [ قوم ] زیخ و چەقێ و ووردە بەردە ، [ نقوم ] رووچوون و ختم بوونە ناو شتە ووشەی [ نقوم ] پیتی [ ن ] ی زیادە لەووشەی [ قوم ] و ئەم پیتە زیادەش لەسەرەتای ووشەی [ نقوم ] ەوە هاتووە .

ب‌ـ یا وادەبێ پیتە زیادەکە لە ناوەڕاستی ووشەیەکیان بێت .
نالی دەڵێ :—

بێ فایدە بوو لاف دەمی خونچـە لە دەمیـا
با خـتی بڕی خوستی کە مشتێکی لە دەمدا

دەڵێ : ڕاستە خونچەی بەهار خۆی هەڵدەکێشاو لاف و گەزافی لێدەدا بەلام هەموو لاف و گەزافەکەی پووکایەوە چونکە لەپڕێکدا [ با ] هات و مشتێکی لەدەم داو ختی ، هەربۆیەش با ئەم مشتەی لەتەپرغەی خونچەکە دا چونکە دیی لاف لە سەر جوانی یارەکەی لێ دەدا ، ئەم هونەرە کە - جوانی بایس - حسن التعلیل - ی پێ دەڵێن جوالێ‌یەکی زۆرو کاریگەرێکی زۆر بەهێزی تێدایە ، ئنجا دەڵێ [ با ] یەکە هەستو خوستی لەبەر خونچەکە بڕی و مەیدان هەر بۆ یار مایەوە . ڕەگەزدۆزی لە ووشەی [ خـتی ] و [ خوستی ] دایە ، دووەم پیتی [ و ] ی لەناوەڕاستەوە زیاترە لەووشەی یەکەم .

جـ- یا وادەبێ پیتە زیادەکە لەبنەتای ووشەیەکیان دا بێت وەکو نالی دەڵێ :

رەقیب و مودەعی وەك [ پووش ] و [ پوشوو ] ن
بـــــووتینین کە وەك بەرقـــین لەبەر قـــین

جارێ لەنیوەی دووەم رەگەزدۆزێك لەنێوانی [ بەرقین ] و [ بەرقین ]دا هەیە و رەگەزدۆزی تەواویشە • ووشەی یەکەم لە ناوێك و راناوێك پێك هاتووە [ بەرق ـ ین ] ، دووەمیش لە ناوێك و لەپاژەیەکی ووشەی پێشەوە پێك هاتووە [ بەر ـ قین ] ، ووشەی [ قین ] مانای رق و کینە و تووڕەیی دەگەیەنێ ، [ بەر ] یش پاژەیەکە لەووشەی [ لەبەر ] کە لەپێش [ قین ]ەوە هاتووە • • • ئەمەشیان رەگەزدۆزی ئاوێتەیە • • • لە نیوەی یەکەمیش دا رەگەزدۆزی کەوتۆتە نێوان [ پوش ـ پوشوو ] ، پوش : ئەو گیا ووشك و نەرم و خۆڕسکەیە کە لە بوورو بەیارا دەڕوێ و کەمترین پروشکە ئاگری بکاتێ کلپە دەسێنێ و ئاگر دەگرێ • پوشوو : شتێکی نەرم و ووشـــکی پفەڵەیە لەهەندێ دار پەیدا دەبێ ، بە بەردو ئەستێ دائەگیرسێنرێ(۱) لـە ناوچەی هەولێر بە [ قاوە ] باوە • [ پوشوو ] پیـــتی ـ وو ـی زیاترە لە ـ پوش ـ ئەم زیادەش لەبنەتاو کۆتایی ووشەکە هاتووە •

۲ـ جۆری دووەمی رەگەزدۆزی زیاد ئەوەیە کە ئەو دوو ووشـــەیەی رەگەزدۆزی‌یان لێ کەوتۆتەوە یەکێکیان دوو پیت لەوەی دی پترێت ئەم دوو پیتە زیادەیەش دەبێ بەدوای یەکەوەبن ، جا ئەو دوو پیتە زیادمیە لە سەرەتا یا لەکۆتایی یا لەناوەڕاستی ووشەوە بێت :ـــ

أ ـ وا دەبێ دوو پیتە زیادەکە لەسەرەتای ووشەکەوە بن •

ئەمنول لە تاك رەگەزێك دا ـ الیتیم ـ(۲) دەڵێ :ـــ

---

(۱) فەرهەنگی خاڵ ب [۱]

(۲) تاك رەگەز : ئەوەیە هۆنەر دێڕە هۆنراوەیەك بەتەنیـــــا بهۆنێتەوە ، ئەمەش بە عەرەبی پێی دەگوترێ « البیت الیتیم » •

. . — — لەبەر زار و کرین چاوم خەریکی پەردە پۆشینە

لەعەشقی نەوجەوانێ سوخمەکەی ناڵەو کەوا شینە

رەگەزدۆزی لە ووشەی [ پۆشین ] و [ شین ] دایە ، یەکەمیان مانای داپۆشین و شاردنەوە دەدات و دووەمیان رەنگێکە . ووشەی یەکەم دوو پیت -پۆ- لە ووشەی دووەم پترە ، ئەم دوو پیتە زیادەش -پۆ- لە سەرەتای ووشەی یەکەمەوە هاتوون .

ب- یا وادەبێ ئەم دوو پیتە زیادەیە بکەونە ناوەڕاستی ووشەیەکیانەوە ، وەکو پیرەمێرد دەڵێ :—

ئەمەندە وێڵی بەرگ و خۆراکین

نازانین خۆمان خۆراکی خاکین

ووشەی [ خۆراکین ] پیتەکانی -ۆر-ی زیاترە لەووشەی خاکین ، ئەم دوو پیتەش لەناوەڕاستی ووشەکەوە هاتوون .

ج- یا وادەبێ دوو پیتە زیادەکە لەبنەتا و کۆتایی ووشەکەوە هاتبن ، رەشوانی دەڵێ :— سەر دەبێ شەیدای سەر سەرین نەبێ

دوور پەرێز خۆشی و تاڵی ژین نەبێ

رەگەزدۆزی لە ووشەی [ سەر ] و [ سەرین ] دایە ، ووشەی [ سەرین ] لەبنەتاوە ئەم دوو پیتەی [ ین ] لەووشەی [ سەر ] زیاترە . . .

## دووەم : رەگەزدۆزی جودا :

ئەو جۆرەش وا دەبێ دوو ووشە یا زیاتر بێنێ کە ژمارەو شێوەو ریزی پیتەکانیان یەك بێ بەلام جۆری هەموو پیتەکانیان یەك نەبێ و لە تاکە پیتێك دا لێك جودابن . . تالی دەڵێ :—

یەعنی گولاوی تودسە کلاوێ دەفع دەکا

ئەو خاکە پاکە چاکەو ئەو ئاوە مطهرە

جگە لەوەی کە رەگەزدۆزی زیاد شاپەڕی بە سەر ووشەی [ گولاو ] ر
[ گلاو ] داکێشاوە . رەگەزدۆزی جودا کەوتۆتە نێوان ووشەکانی [ خاکە،
پاکە ، چاکە ] . ئەم سێ ووشەیە ژمارەی پیتەکانیان هەندی یەکە ، ریزی
پیتەکان لەهەموو ووشەکاندا وەکو یەکە ، شێوەی پیتەکانیشیان هەر یەکە،
بەلام جوری پیتەکانیان یەك نی‌یە ، هەرسێکیان لەپیتی یەکەم لەیەك دادەبڕێن
کە پیتی یەکەم لەووشەی یەکەم [ خ ] و لەووشەی دووەم [ پ ]و لەووشەی
سێیەم [ چ ] . . . . مەولەوی دەلێ :—

قازان چون یاران ناواتە خوازان
ئەتارە بەستەن مەکەران رازان
بێ لەیل ئاخ ئامێ جە ئێلاخەوە
پەی ئاخ داخ تەك دان بە [ ئاخ داخ ] ەوە

ئامێ : هاتن ، تەك دان : پال دان ، پالیان داوە. ئاخ داخ : کێوێکە
نزیك قەسری شیرین . . .

قازەکانی کوێستان لەبەر سەرماو بەستەلەکی زستان سەریان هەلگرتو
رووە و گەرمەسێر هاتنەوە ، وەك هاوڕێ و برادەری موشتاق بە ناواتەوە
ریزیان بەستووەو راز و نیازی دلیان بۆ یەکتر هەلدەرێژن ، بەلام داخی
داخانم لەیلایان لەگەل دا نەبوو . . بەتەنیایی‌و بێ لەیل لەوسەرەوە بەئاخو
ئۆف‌و حەسرەتەوە هاتنە خوارەوە ، لەداخ‌و خەفەتو پەشێوی‌و سەرگزی‌و
نارەحەتی‌دا چوون پالیان بەکێوی [ ئاخ داخ ] ەوە دا ، لەپێش دا رەگەزدۆزی
لەنێوانی [ ئاخ داخ ] ی یەکەم‌و [ ئاخ داخ ] ی دووەم هاتووە ، یەکەم بریتیە
لەدوو ووشەی هاوتا کەبۆ دەربڕینی خەم‌وخەفەت‌و پەژارەو پەستی بەکاردێن
دووەمیش ناوێکە ، ناوی شاخێکە لە نزیك قەسری شیرین ، ئەوەشیان بەر
رەگەزدۆزی ساوتە دەکەوێ وەك لەپێشەوە باسمان کرد . .

جگە لەمەش [ ئاخ ] و [ داخ ] ی یەکەم ڕەگەزدۆزییان ئەدەکەوێتەو
چونکە تەنیا پیتی یەکەمیان جودایە ، بۆیە ڕەگەزدۆزییەکە ڕەگەزدۆز
جودای پێ دەکوترێ .

## سێیەم : ڕەگەزدۆزی لار :

ئەوەش وا دەبێ ، دوو ووشە یا پتر بێنێ ، لە ژمارە و جۆر و ریز
پیتەکانیان وەکو یەك بن ، بەلام شێوەیان جودابێ ، شێوە جوداییەکە ا
یەکێ لەمانەی خوارەوە دەبێ :

أـ لەبەر هەبوون و نەبوونی خاڵ [٠] وەکو پیتی [ر ـ ز] کە ئێـــکو
بنەڕەتییان یەکە بەلام بەهۆی یەك خاڵ لەیەك جودا دەبنەوە یا وەکو [ح
خ ـ ج] یا وەکو [ف ـ ق] ..

ب ـ لەبەر هەبوون و نەبوونی نیشـانەی [٧] وەکو پیتی [ڕ ـ ر] یا وەک
[ل ـ ڵ] یا وەکو [و ـ ۆ] یا [ی ـ ێ] .

أـ ئەگەر دوو ووشەکە لەبەر هەبوون و نەبوونی خاڵ لێك جودا بکرێتەو
وەکو صافی دەڵێ :ـــ

ئەی نیگارا بەسیە با دەرگەی وەفا بکرێتەوە
تابەکەی هەر دڵ لەزیندانی جەفا بکزێتەوە

ئەم دوو ووشەیە [ بکرێتەوە ـ بکزێتەوە ] ئێـك و ئەشك و کەلەخیا
یەکە ، بەلام ئەوەندە هەیە لەووشەی دووەم خاڵێك پەڕیوەتە ســـەر پیتز
[ر] و بووە بە [ ز ] ، واتە [ بکرێتەوە ] بووە بە [ بکزێتەوە ] ، ئەمەشیا
بەبێ ئەوەی شێوەی بنەڕەتییان بشێوێ ، بەدانانی یەك خاڵ تەواوی دەنگ
ئاوازو واتای ووشەکە لە بن و بۆتکەوە دەگۆڕێ .

لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین ئەم دوو ووشەیە بەر ڕەگەزدۆزی جود
دەکەون ، پیتی سێیەمیان جودایە ـ ر ، ز ـ ، بەم جۆرە هەموو ڕەگەزدۆزیکو

لار بەر رەگەزدۆزی جودا دەکەوێ چونکە کە بەخاڵێك یا بە [۷]ێك لێك جودا بوونەوە مانای وایە دوو ووشەکە لەم دوو پیتە دا جیاوازی‌یان هەیە کە یەکێکیان [۰] یا [۷]ی لەسەرە یا لەژێرەو ئەوەی‌تر نیەتی ۰۰ بەلام مەرج نی‌یە هەموو رەگەزدۆزێکی جودا رەگەزدۆزی لار بێت ، چونکە لە رەگەزدۆزی جودادا ئەوەندە بەسە کە دوو ووشەکە پیتێکیان جودابێ، جا پیتەکان لەبنەڕەتەوە جودابن وەك [ل. م] یا [ك. ق.] یا بەهۆی [۷] یا [۰] لێك جودابن ۰۰ واتە هەموو رەگەزدۆزێکی لار رەگەزدۆزی جودایە بەلام هەموو رەگەزدۆزێکی جودا رەگەزدۆزی لار نی‌یە .

ب- یا وادەبێ دوو ووشەکە لەبەر هەبوون و نەبوونی نیشانەی [۷] بەسەر یا لەژێر پیتێکەوە دەنگ‌و واتای ووشەکان بگۆڕێ و بیانکا بە رەگەزدۆزی لار. نالی دەڵێ :-

ئاو دەلاتەی تێ دەخا چێشت و مەکی پێدا دەبا

من لەوێ حەیران دەبم وەك ماڵ بڕاو ماڵ براو

ئێـك و شێوەی ئەم دوو ووشەیە [ ماڵ بڕاو ، ماڵ براو ] یەکە بـەلام ئەوەندە هەیە [ر]ی ووشەی یەکەم بەم نیشانەیە [۷] قەڵەو کراوەو بەم قەڵەوکرانەش مانای گۆڕاوە ۰۰ واتە هەریەکەیان مانایەك دەدات ، ئەوەش رەگەزدۆزی لارە ، چونکە ماڵ بڕاو ، ئەوکەسەیە کە ماڵی بڕاوەو شـتی لێ دزراوە ، ماڵ براویش ئەوکەسەیە کە خەڵکی‌تر هاتوونماڵیان بردووە جا دیارە هەریەکە لەم دوو ووشەیە واتایەك دەدات‌و لەڕواڵەت‌و ئێـکیشدا زۆر لە یەك نزیکن ، ئەوەشیان هەر وەکو بەشەکەی‌تر بـەر رەگەزدۆزی جودا دەکەوێ ، چونکە لەم هەردوو ووشەیەدا پیتی - ر - جودایە ، لەیەکێکیان قەڵەو و لەوەی‌تر لاوازە ، ئەو دوو پیتەش [ر-ڕ] دەنگیان جودایـە ، نووسینیان جودایە ، کەواتە ئەم دوو ووشەیە لە پیتێك جودان کە لە پیتێکیش جودابن دەبێتە رەگەزدۆزی جودا ۰۰۰

## چوارەم : رەگەزدۆزی ئاڵۆز :

رەگەزدۆزی ئاڵۆز ئەوەیە دوو ووشە یا پتر بێنێ کە ژمارە و شێوە و جۆری پیتەکانیان یەك بێ بەلام ریزی پیتەکانیان یەك نەبێ ، واتە پیتەکان پاش‌و پێش‌کرابێ‌و شوێنیان ئاڵوگۆڕ کرابێ وەکو : [ بەرداش شابەردێکی زلە ] •

[ شابەرد ـ بەرداش] ئەم دوو ووشەیە کەوتوونەتە ژێرسێبەری رەگەزدۆزی ، ژمارەی پیتەکانیان هەندی یەکە هەر یەکە لە شەش پیت دروست بووە ، جۆری پیتەکانیشیان یەکە و هەردووکیان لەم پیتانە ( ش. ا. ب. ە. ر. د. ) پێك هاتوون‌و هیچ پیت نی‌یە کە لە یەکێکیاندا هەبێ‌و لەوەی‌تردا نەبێت هەروەها شێوەی پیتەکانیش یەکەو هیچ پیتێك لەپیتەکانی ئەم دوو ووشەیە بەهۆی (٠) یا (٧) شێوەکەی نەگۆڕاوە • • • بەلام ئەوەندە هەیە ریـــزی پیتەکانیان جودایە ، واتە ئەو شەش پیتەی دوو ووشەکەیان دروست‌کردوە لەهەردوو ووشەدا بەیەك جۆر ریز نەکراون بەلکو ریزی پیتەکان لەیەکەمەوە دەگۆڕێ تادووەم ، ئەوەش پێی دەگوترێ رەگەزدۆزی ئاڵۆز• نالی دەڵێ :ـ

خاطرێکی شۆخ و خۆشی بێ غەم‌و جەمعم هەیە
ئێـــستە بۆ زولفی کەسێ مەشقی پەرێشـــانی دەکا

ووشەی ( شـــۆخ ) و ( خۆش ) کە شوێنی پیـــتی ( ش ـ خ ) گۆڕاوە ، رەگەزدۆزی ئاڵۆزیان پێك هێنـاوە •

## هەندێ جۆری رەگەزدۆزی

لەسەرەتاوە تائێستا رەگەزدۆزیمان کردە دووبەش : رەگەزدۆزی تەواو رەگەزدۆزی ناتەواو • زانیمان کە رەگەزدۆزی تەواو دەبێتە چوار جۆر : رەگەزدۆزی رەسەن ، رەگەزدۆزی تەبا ، رەگەزدۆزی ئاوێتە ، رەگەزدۆزی ساوێتە ؛ هەریەکە لەمانەمان بەپێی توانا روون کردەوەو بەڵگەو نمونەمان

بۆ هێنا. ئەوەشمان زانی کە رەگەزدۆزی ناتەواو چوار بەشە : رەگەزدۆزی زیاد ، رەگەزدۆزی جودا ، رەگەزدۆزی لار ، رەگەزدۆزی تاڵۆز . هەریەکە لەمانەشمان روون کردەوەو نموونەمان بۆ هاوردن . .

جگە لەو جۆرە رەگەزدۆزییانەی تا ئێستا باسمان کردوون ، هەندێ جۆری تری رەگەزدۆزی هەن کە لەمەودوا دەیانخەینە بەرچاو :ـ

## ١ـ رەگەزدۆزی جووت :

ئەوەیە کە ئەو چەند ووشەیەی دەکەونە ژێر ئاڵای رەگەزدۆزی ـ جا هەر جۆرە رەگەزدۆزییەك بێ ـ لەتەك یەکەوە بێن و هیچ ووشەی دابڕیان لە نێوان دا نەبێت . نالی دەڵێ :

لەگەل مورغی چەمەن نالی دەنالێ
کە یەعنی عاشقی هەم نەردو فەردین

[ نالی ـ دەنالی ] ، [ نەرد ] [ فەردین ] ، ئەمانە کە رەگەزدۆزی زیادیان لێ کەوتۆتەوە ، هەر دوو دوو بە دوای یەکەوە هاتوون و رەگەزدۆزی جووتیان دروست کردووە . . . دوو پارچە بەناوبانگەکەی [ زیوەر ] ، هەردووکیان بەر ئەم جۆرە رەگەزدۆزییە ـ جووت ـ دەکەون . کەپارچەی یەکەم سەرەتاکەی بەم دێرە دەست پێ دەکا :ـ

با نەچێتە لای رەقیبان یار ئەنیسی خانە بێ
لازمە ئەو ناسکە لەولا نەبێ لەو لانە بێ

پارچەی دووەمیش سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێ دەکا :ـ

کێیە تا سەر لەنەزای دەرد و غەمایێ مابێ
ئەوە هەر کوردە کە چاوی لە هەوابێ وابێ

## ٢ـ رەگەزدۆزی دووپات :

ئەوەش وا دەبێ دوو ووشە بێنێ کە رەگەزدۆزییان لێ کەوتبێتەوە و

هەردووکیشیان لەیەك یەك هاتبن واتە رەکەزدۆزی جووت بن ، سەرەڕای ئەمەش دەبێ ووشەی دووەم پیتێك یا دوو پیتی لە بنەتا و کۆتایی یەوە لە ووشەی یەکەم پتر بێت ..

لەم جۆرە رەکەزدۆزی‌یە کە خوێنەر یەکەم‌جار ووشەی یەکەم دەخوێنێتەوەو ئاوازو ماناو کاریگەری ووشەکەی دەڕژێتە دڵو دەروونو دێتەسەر ووشەی دووەم و نیوەی دەخوێنێتەوە بەکوڕ ئەو هەستەی بە مێشكو دڵو خەیاڵ دا تێدەپەڕێ کە ئەمە هەر ووشەکەی پێشووە دووپات بۆتەوە، کەچی ئەوەندەی پێ ناچێ سەر لەبەردی ئەلەد دەداتو لەم خەیالە دەگەڕێتەوە ، ئەوەشیان ئەو کاتە دەبێ کە ئەواوی ووشەکە دەخوێنێتەوەو بۆی دەردەکەوێ کە ئەم ووشەیە ووشەیەکی سەربەخۆیە و دووپاتکردنەوەی ووشەی پێشوو نی‌یە.. ئـەو لەحزە پڕ ئاسەو شەوق و خرۆشی‌یەش کە باری دەروونی خوێنەری پێدا دەڕوا تین و تاێنکی تایبەتی و کاریگەرێکی بەهێز دەکاتە سەر دڵ و ویژدان و دەروونی‌یەوەو لافاوی سۆزو گوداژی هەڵدەکات. پیرەمێرد دەڵێ :

شەو شەونمی ئەوانە چیمەن ئاو ئەخواتـەوە
رۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەربەخاتـەوە

[ شەو ـ شەونم ] دوو ووشەن ، رەکەزدۆزی زیاد باڵی بەسەردا کێشاون ، چونکە ووشەی دووەم دوو پیتی لە ووشەی یەکەم زیاترە ، سەیـر دەکەی کاتێك کە پیاو ووشەی یەکەم دەخوێنێتەوە ( شەو ) و ئنجا دێتەسەر ووشەی ( شەونم ) ، لێی ناگیرێ ئەگەر سەرەتا ئەوەی بەدڵ دا تێ پەڕێ کە هەمان ووشەی پێشووە دەیڵێتەوە ، چونکە نیوەی یەکەمی ووشەی دووەم بریتی‌یـە لە ووشەی یەکەم ( شەو ـ نم ) . بەلام لەپڕ خەیالی تیژڕەوی سەر لەئاسەی ئاسمان دەدات و دەڕژێتەوە سەر زەوی لێکدانەوە ، کاتێ کە چاوی بەپیتە زیادەکان دەکەوێ و دەزانێ هەمان ووشەی پێشوو نی‌یە دووپـات بۆتـەوە بەلکو ووشەیەکی سەربەخۆیە .

هەروەها لە رەکەزدۆزی دووپات دا کوردی دەڵێ :

چوار چت قەت مەکە خواهش لەدونیا کوردی تاماوی
لەخۆت عەقڵو لەدڵ صیدو لەبەخت امداد لەیار یاری

## هەندێ تێبینی :

أ ـ رەکەزدۆزی جووت دەگونجێ رەکەزدۆزی تەواو بێ ، هەروەهـــا دەشگونجێ رەکەزدۆزی ناتەواو بێ ، ئەوەندە بەسە بۆ رەکەزدۆزی جووت کە ئەو ووشانەی رەکەزدۆزیان لێ دەکەوێتەوە لە تەنیشت یـەك بێن ، ئیتر گرنك نییە هەر جۆرە رەکەزدۆزییەك بێ .

ب ـ هەموو رەکەزدۆزێکی [ دووپات ] رەکەزدۆزی [ جووتە ] ، چونکە رەکەزدۆزی جووت ئەوەیە کە ئەو ووشانەی رەکەزدۆزی دەیـانکرێتـەوە لەتەك یەك بێن ، جا هەر جۆرە رەکەزدۆزییـەك بێ هەر دەبێ ، بەڵام لە رەکەزدۆزی [ دووپات ] دەبێ دوو ووشەکە لە تەنیشت یەکەوە بێن لە هەمان کاتیشدا دەبێ رەکەزدۆزی زیادیان لە نێوان دا بێ ، ئەم زیادەش دەبێ لە کۆتایی ووشەی دووەمەوە بێت... بەڵام مەرج نییـە هەمـــوو رەکەزدۆزێکی [ جووت ] رەکەزدۆزی [ دووپات ] بێ ، چونکە ئـەو دوو ووشەیەی رەکەزدۆزییان پێك هێناوە و لە تەنیشت یەکەوە هاتوون ئەشێ رەکەزدۆزی تەواو یا رەکەزدۆزی رەسەن یا ئاڵۆز یا لار یا رەکەزدۆزی جودا بێن...

ج ـ رەکەزدۆزی دووپات بەر رەکەزدۆزی زیاد دەکەوێ ، واتە هەموو رەکەزدۆزێـــکی دووپات رەکەزدۆزی زیادە ، بەڵام مەرج نییە هەمـوو رەکەزدۆزێکی زیاد رەکەزدۆزی دووپات بێ ، چونکە لە رەکەزدۆزی پات هەر دەبێ ووشە زیادەکە یا ووشە زیادەکان لە کۆتایی ووشەی دووەمەوە بێن کەچی لە رەکەزدۆزی زیاد بۆی هەیە لە کۆتاییەوە بێن هەر وەکو بۆیشی هەیە لەسەرەتا یا لەناوەراستەوە بێن.. هەروەها ئەشگونجێ ووشەی

یەکەم لەووشەی دووەم پتر بێ وەك چۆن ئەگونجێ ووشەی دووەم لەیەکەم پتر بێ ، کەچی لە رەگەزدۆزی دووپات دا هەر دەبێ زیادەکە لە ووشەی دووەم‌دا بێت‌و ئەم زیادەیەش هەر دەبێ لە کۆتایی ووشەی دووەمەوەبێ ٠

---

## ـ سەروادار ـ

سەروادار ئەوەیە کە دوو هەڵوێستی پەخشان یا پتر لە سەر یەك پیت یا پتر بوەستن ، سەروای هەڵوێستەکان وەکو سەروای هۆنراوە وایە ٠
ئەوەندە هەیە لە هۆنراوەدا دەبێ کێشیشین یەك بێ بەڵام لە پەخشان دا مەرج نی‌یە ٠ وەکو :
[ تەقیلە لەسەر تەقیلە ، هەرکەس نەیلێ زەلیلە ، پشکۆ لەسەر سەبیلە ]
ئەم سێ هەڵوێستە هەرسێکیان کۆتایی‌یان بەم برکەیە [ یلە ] هاتووە ئەم یەك کرتنەش لە پیتی یا برکەی کۆتایی دەیانکا بە سەروادار٠ یاخود وەکو : [ بابی بابی ، حەمەدەی رابی ، تەقڵەی لە چەندان دابی ](١)
دوابەندی ئەم هەڵوێستانە بە [ ابی ] هاتۆتەوە ٠
ئەوەش بزانین بلشە کە سەروادار روو لەم دونیایە دەکا کە قسەی تیا

---

(١) ئەمە یاری‌یەکی منداڵانەیە ٠ پیرەمێردیش لە پەندەکانی دا ناوی ئەم یاری‌یەی هێناوە و دەڵێ :

ئێستا ناوێری لە کونێ دەرکەوێ
بە ( بابی بابی ) مەکەر سەرکەوێ

بابی بابیشمان لە بەهـارایە
بەهاریش هێشتا شەڕ لەکارایە

بڕگە بڕگە دەوەستێ‌و بڕگەکانیش بەرامبەر یەك رادەوەستن ، ئەم بەرامبەر بوونەش هێزێکی دەروونی توند بەرپا دەکات . لەگەڵ ئەوەش‌دا سەروادار هەر تەنیا بەهۆی بەرامبەر یەك بوونی بڕگەی هەڵوێستەکان نییە ، چونکە ئەگەر هەمووی هەر ئەوەندە بوایە ، ئەوەی دەستی قەڵەم بگرێ دەیتوانی شت بخاتە قالبی سەروادارەوە ، سەروادار دەبێ ووشەی نەرم و ناسك و هەڵبژاردەو لەجێ بێ ، مانایەکی قووڵ و خەست بدا بەدەستەوە . . خۆ ئەگەر بێت‌و نووسەر هەر بەدوای ووشەدا بگەڕێ‌و مانا پشت گوێ بخات ئەو حەلە نووسینەکەی ساردو سڕ و خاو و خلیچك دەردەچێ و کیاتێکی وای تێدا ناگەڕێ کە کاریگەرێکی بێ ، بۆیە دەبێ ووشە بۆ مانا بێت و مانایەك دەرببڕێ ، ئەگینا نرخی نابێ . . واتە دەبێ ووشە دەربڕی مانا بێت نەك واتاکان شتی سانەوی بن و شوێن پێی ووشە بڕراوەکان بکەون واتە ئەو حەلە سەرواداری ڕاستەقینە دروست دەبێ کە نووسەر واتایەکی لە دڵ‌دا بێت و واتاکە بە تەواوی رابگەیەنێ‌و بەدەم واتا راگەیاندنەکەوە ووشەکان خۆیان بۆ خۆیان سەروایەك دروست بکەن ، نەك لە پێش دا لە ئەرهەنگ بگەڕێ ووشەی سەروادار هەڵبژێرێ ئنجا بێت و لە تەنیشت یەکتریان رابکات و هەوڵ بدات مانایەکیان لێ پەیدا بێ جا هەرچی مانایەك بوو .

توخوا سەیرێکی [ مێژووی ئەدەبی کوردی ]ت نەکردووە؟ نەت‌دیوە مامۆستا سەجادی پێشەکی شاعیرەکانی بە چ جۆرە سەروادارێکەوە رازاندۆتەوە ؟ هەستیشت بەوە نەکردووە چۆن لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم پێشەکییانە دا پیاو لەئەنجی ناخەوە دەهەژێ و هەست و سۆزی دەبزوێ‌و جۆش و خرۆشێکی کەف‌کردووی دەکەوێتە دڵ و دەروونەوە ؟.. ئەگەر هێز و تەووژمی سەروادارە سروشتییەکە نەبێت دەبێ چ شتێ ئەو تەلەسم‌و ئەفسوون و کاریگەرەی رژاندبێتە ناو ئەو پێشەکییانە . . . ئەمەش

نموونەیەك لەو پێشەکی‌یە کە بۆ نالی نووسیویە :

« لە ئاســـمانی خەیاڵات دا بازی بێ پەروا ، لە زەوی و زاری نوکتەزانی دا سکەیەکی خۆش رەوا ، زەوقی بـە خاکی پاکی شارەزوور پشکووتوو ، خۆیشی بە چەشمەزاری پڕ نیـــگاری کوردستان دڵ تینوو ، شەیدا بە دوڕ و قـەو باسی بەرزەوە ، زانا بە گەوهەری مەعنای جۆار و جۆری سەد تـەرزەوە ، هەندێ قـەی رەوان و گەوارا وەکو ئاوی ساف هەندێ ووتەی رەق و قایم وەکو تەلیسمی قاف ، هەندێکی شـــووشـــە ئەباتیکە پێی ئەڵێ جناس ، ئەمە بۆ لاف ، ئاوی ژیانی شیعری لە بادەی تەبعی رەوانا خواردۆتەوە ، دەمار و فکری جوانی بەبۆنی باخچەی ئەدەب بووژاندۆتەوە ، گیانی بە دەنگ و باسی گەلێ عیلمی بەنرخ گەشاندۆتەوە ، ئنجا بەنازەوە پێی ناوەتە مەیدانی شاعیران و گەوتۆتە رەوتەوە . . »

ئایا دوای خوێندنەوەی ئەم پێشەکی‌یە و پێشەکی‌یـەکانی دی ناکەویە سەر ئـەو بـاوەڕە کە سەروادار لە زمانی کوردی دا زۆر جوان دێت و زۆر چاکیش لە [ سجادی ] دەوەشێتەوە و ئەو بڕوایەت لا نـاپووکێتەوە کە دەڵێ ئەدەبی کوردی، بەخشانەکەی ئەومندە بـەهێز نی‌یە و بە تەواوی نـاکەویە سەر ئەو باوڕە کە ئەدەبی کوردی زۆر بە هێزەو زۆر چاکیش سەرواداری لێ دەوەشێتەوە . .

ئەمە دەربارەی ئەو سەروادارەی کە لە بەحرەیەکی گەشاوە هەڵدەقوڵێ و بەشێوەیەکی تەبیعی دادەڕژێ ، بەڵام ئایا چۆن دەزانین ئاخۆ سەروادار لەسروشتەوە هاتووە ؟ یا دەستکردی خۆکوشین و ئـازار کێشـانە ؟ ئەگەر ئەو ووشانەی بەکار هاتوون هەریەکە بەتەواوی وەك خشتی دیـوار جێگەی خۆی گرتبێ و لادانی ئەو ووشانەو دانانی هەر ووشەیەکي تر لەشوێنی ئەوانەوە ماناکە بێ هێز بکا نەك بەهێز ، دیارە سەروادارەکە سـروشتی‌یە ودەستکـردی خۆ کوشین نی‌یە . . جگە لەم هەموو مەرج وتەرجـانەش

که باسمان کردن دەبێ سەروادار هەموو هەڵویستەکانی مانای تایبەتی خۆیان هەبێت و نابێ مانایان یەك شت بێ . .

بەکورتی سەروادار ئەم شتانەی تێدا بەدی نەکرێ تەواو دەرناچێ :

١ ـ لەبارەی ووشەکانەوە ، دەبێ نەرمو ناسك بن‌و تەڕو پڕو پاراو بن .

٢ ـ لەبارەی بڕکەکانی هەڵویستەکانەوە دەبێ بڕکەکان تەباو تفاق بن‌و بەرامبەر یەك بوەستن‌و ووشە یا بڕکەی کۆتاییان وەکو یەك بێ .

٣ ـ ووشەکانی خزمەتی گوزارەی بکەن ، نەك گوزارەی لاوەکی بکەونە بن پەلکی ووشەکانەوە .

٤ ـ دەبێ هەر هەڵویستێك واتای سەر بەخۆی هەبێ ، دوور بێ لەواتای هەڵویستەکانی‌تر ، کە دەڵێم دوور بێ مەبەستم ئەوەیە هەمان شت نەبێ کەوتبێتە بەرگێکی تـرەوە بەڵکو تەواو کەری هەڵویستەکانی تر بێت وپێکەوە ماناکە رابگەیەنن .

# سەروادار لە ئەدەبی کوردی‌دا

کورد لە کۆنەوە لەبەر هەر هۆو سەبارەتێك بووبێ نەیتوانیوە خەریکی نوسینەوەو پێش خستنی زمان‌و ئەدەبەکەی بێت ، بەڵام کە نەیتوانیوە مانای وانی‌یە دەستە پاچە دانیشتووەو رازی دلی کردۆتە گرێ‌و دەری نەبڕیوە ، چونکە کورد هەموو رێگایەکی دەربڕینی لێ گیرابێ گەرووی قسە کردن‌و گۆرانی گوتنی هەر ماوە کە ببێ بەکەلێنێك‌و دەرپای رازی تیا سەربکا ، بۆیەش کورد لەکۆنەوە تائەمرۆ لە هەموو شتێ زیاتر پابەندی گۆرانی‌و ئاواز خوانی بووە ، چونکە سروشتی کوردستان بەئاوو خاك‌و شاخ‌و دۆل‌و هەوایەوە لەلایەك ، چەرخی زەمانەو رۆژگاری دژواریش لەلایەکی ترەوە ، هانیان داوەو سۆزی دەروونیان تەقاندووەو وایان لێ کردووە کە ئەشقی گۆرانی بێت هەر بۆیەشە کورد لە کۆنەوە ئەشقی هۆنراوە بووە ، تابەم دەورانەی دوایی هەر هۆنراوە باوی بووە جا وورده وورده پەخشانیش سەری قیت کردەوەو کەوتە ناوەوە ، وا خەریکە ئەویش راست دەبێتەوە بۆ ئەوەی دەست بداتە دەستی هۆنراوەو هێزیان بکاتە یەك‌و ئەدەبی کوردی بۆ چلەپۆپەی بەرزی بفرێنن .. بەڵام قەیدی چی‌یە ، با بەو دوایی‌یە پەخشانی کوردی خۆی بەسەر کاغەزەوە دیێ ، ئایا ئەوە ئەوە دەردەخا کە کورد پەخشانی نەبووە ؟ نەخێر . چونکە کورد مادام نەتەوەیەکی سەربەخۆیەو رازی دلی بە زمانێکی تایبەتی گۆڕیوەتەوە کە زمانی کوردی‌یەو بەو زمانە لە هاورەگەزو هاو زمانەکەی گەیشتووەو گەیاندووە ، ئەو گفتوگۆو راز گۆڕینەوەیە پەخشان بووە بانەش نووسرابێتەوە ، جا ئەگەر ئێمە بمانەوێ لە پەخشانی کوردی بدوێین نابێ تەنها چاو بدەینە ئەم چەند ساڵانەی کەپەخشانی تیا کەوتۆتە سەر کاغەزو بەرنووکی قەلەم .. ئەدی چۆن بتوانین پەخشانی کۆن

دەست بخەین‌و زیندووی بکەینەوە ؟ بێ‌گومان فۆلکلۆری دەوڵەمەندی کوردیمان بەچیرۆك‌و داستان‌و ئەفسانەو بەپەندی پێشینان‌و قسەی نەستەق‌و مەیل‌و مەتەڵ‌و بەستەو گۆرانی‌و ... تێکرا تیشکێکی ئەدەبی کۆنمانن خۆیان بۆ ئەم زەمانە پاراستووەو هێشتۆتەوە .. کە ئێمە باسی بەخشانی کوردی دەکەین مەبەستی هەرە گەورەمان سەرواداره کە جێگەی باسی ئێرەمانە .. سەرواداریش لە کوردی‌دا زۆر هەبووەو هەیە ، بەڵام بێیە دیارنی‌یە کە نەنووسراوەتەوە ، بەڵکەشمان ئەم هەموو مەیل‌و مەتەڵ‌و پەندو قسەی نەستەق‌و کۆتەی منداڵان‌و چیرۆك‌و داستان‌و ئەفسانانەیە کە کە ئێستا پشت بە پشت‌و سنگ بەسنگ ماون‌و پارێزراون ..

## جاری سەروادار لە پەندی پێشینان‌دا :

١ ـ نەپێلاوی تەنگ ، نەخانەی بەجەنگ

٢ ـ هەتا نەینا لە تەبەق نەیکوت سەددەق

٣ ـ ئەوەی سەری ئەپۆشی ، ژێری ئەفرۆشی .

٤ ـ سم سمی کەرەو چنگ چنگی مەیاسن ، من سەرم لەم کارە ئەناوسی .

٥ ـ ئەقیر ئەیەڵێ لە ئاش بێتەوە ، دەوڵەمەند نایەڵی لەساج بێتەوە .

٦ ـ کە هەتیوچە سوار ئەبێ ، لای لنگەکەی خوار ئەبێ ، ئەگەر ئەیکریت هار ئەبێ .

٧ ـ گولۆلەم گەونە لێزی ، کەس چاکم پێ نانێزی .

٨ ـ ماڵەکەی تۆ ئەخۆم بە بەلاش ، هێنەکەی خۆم ئەخەمە پاش .

٩ ـ من بووم بەتۆ ، تۆ بووی بەمن ، من بووم بەجن ، تۆ بووی بەژن .

١٠ـ نوێژ کەری ئووریخە ، فەرمانکەری شیرینیت .

## ئنجا سەرواداڕ لە مەیلی کوردیدا :

١ ـ سەری هەسانە ، بنی قورمانە .

٢ ـ تەیرەك دێ بە هانە هان ، شاقەل سپی دندووك کەوان ، عبـــا لە مووسا دەپرسی ، ئەو تەیرە لۆ هەندە برسی .

٣ ـ هەورۆکە ، لێی دەباری بەفرۆکە .

٤ ـ تەپ لەسەر تەپی ، دەست لەناو رەپی .

٥ ـ چوار مامم هەیە لە دۆلەکێ ، ئەوان داونە جۆمەکێ .

٦ ـ سەری قەسپە ، ملی هەسپە ، کلکی دارە ، پێی مشارە .

٧ ـ هانیان‌و مانیان ، بەردە سپی‌پێ‌کانیان ، دەکری رێی کاروانیان .

٨ ـ کڵاوی هەمزە پاڵەوان ، ئەتیکی هەیەو ئەدوورمان .

٩ ـ مامەکم هەیە لە دەشتێ ، سی‌وسێ کون لە پشتێ .

١٠ـ سەری تیژە بنی کونە ، کەرە قام‌کە سووژنە .

## ئنجا سەرواداڕ لە ئەفسانەو چیرۆکی کۆن

ئەم چیرۆك و ئەفسانەو داستانانەی دەم بە دەم بۆمـان گێردراونەتەوە ئەگەر ئەش نووسرابنەوە بەڵام پڕاو پڕی سەرواداڕن ، بۆ نموونە با باسی چیرۆکی سێ کۆسەکە بکەین :ـ

دەگێرنەوە دەڵێن سێ کۆسەی زۆر سەگو فێڵباز دەبن ، شەیتانـ ناوبنێ خۆیان لەقەرە بدا ، پارەیەکی زۆریـان دەبێ ، پـارەکە لای پیرە دایکیان دادەنێن ، رۆژێك هیچێکیان لەمـاڵ نابن کابرایەکی لایدە دێت‌و بەهەر فرت‌و فێڵێك بێ پـارەکە لەبـەر دەستی پیرەژن دەردێنێ‌و لێ دەدا دەڕوا ، ئێوارێ کە کوڕە کۆسەکانی دەگەڕێنەوە ، پیرەژن هوردوبـاریـك مەسەلەکەیان بۆ دەگێرێتەوە . . کوڕەکان دەورە لە پیرەدایك دەدەنـ و

لێی دەپرسن ئاخر ناوی چی بوو ؟ لەکوێ هاتو کوێوە چوو ؟
کابرایەکی چۆن بوو ؟ نیشانەی چی بوو ؟ پیرەژن گوتی بەخوا هەر ئەوەندە
دەزانم ( میوانێکی سەر بەڕۆت بوو ) . . ئیتر ئەم قسەیە بەس بوو بۆ
ئەوەی سەرەداوێکیان چنگ بکەوێو بەم چەشنەی خوارەوە بکەونە راوێژو
گفتو گۆ کردنو کابرای دزە بدۆزنەوە :-
یەکەم : میوانە .
دووەم : لەسەری ڕۆتە .
سێیەم : لەسەری ڕۆتە ، لەبن هەمبانە .
یەکەم : لەسەری ڕۆتە ، لە بن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ،
دووەم : لەسەری ڕۆتە ، لە بن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانـــە ، سێ
نووردیان لەناو نانە .
سێیەم : لەسەری ڕۆتە لەبن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ نووردیان
لەناو نانە ، دەیبەن لە بۆ کاروانە .
یەکەم : لەسەری ڕۆتە ، لەبن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ
نووردیان لەناو نانە ، دەیبەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە .
دووەم : لەسەری ڕۆتە ، لە بن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ
نووردیان لەناو نانە ، دەیبەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە ،
مالیان لەگەڕەکی ئالبەندانە .
سێیەم : لەسەری ڕۆتە ، لەبن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ
نووردیان لەناو نانە ، دەیبەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە ،
مالیان لەگەڕەکی ئالبەندانە ، پیاوەکە ناوی مام رەمەزانە .
یەکەم : لەسەری ڕۆتە ، لەبن هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ
نووردیان لەناو نانە ، دەیبەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە .

مالیان لەکەرەکی ئالبەندانە ، پیاوەکە ناوی مام رەمەزانە ، ژنەکەی ناوی پوور خەندانە .

دووەم : لەسەری پۆتە ، لەبنی هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە ، سێ نووردیان لەناو نانە ، دەیەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە ، مالیان لەکەرەکی ئالبەندانە ، پیاوەکە ناوی مام رەمەزانە ، ژنەکە ناوی پوور خەندانە ، پارەکە لەناو ئاخوڕێ کایانە .

سێیەم : لەسەری پۆتە ، لەبنی هەمبانە ، هەمبان هەمبانی نانە سێ نووردیان لەناو نانە ، دەیەن لەبۆ کاروانە ، بۆ وولاتی هەمەدانە ، مالیان لەکەرەکی ئالبەندانە ، پیاوەکە ناوی مام رەمەزانە ، ژنەکەی ناوی پوور خەندانە ، پارەکە لەناو ئاخوڕی کایانە ، دوو قرانیان بەسپیل دانە .

که کۆسەکان بەم ئەنجامە گەیشتن هەستانو بەرەو وولاتی هەمەدان کەوتنە رێ ، لە هەمەدان چوونە دیوەخانی پاشاو سکالای پارە دزینەکەیان لا کردو گوتیان مام رەمەزان پارەکەی دزیوین دەبێ بۆمان رەت کاتەوە ، پاشا بانگیمام رەمەزانی کرد،مام رەمەزانی کەلەکەوێت گوتی حاشاو حاشا من پارەم نەدیوە ، پاشا رووی لە کۆسەکان کردو گوتی بەلگەتان چی‌یە کە مام رەمەزان پارەی دزیون ؟ برا گەورەکە مەسەلەکەی بۆ گێرایەوەو گوتی بەم چەشنە تواتیملن مالی دزراوەمان بەسەر بکرێنەوەو کابرای دزە دەست نیشان بکەین ، پاشا گوتی باشە تاقی‌تان دەکەمەوە ئەگەر شتی واتان پێ کرا دیارە راست دەکەنو مام رەمەزان دزە ئەگەرنا ئێوە بوختـان کەرو شەڕ فرۆشنو دەبێ شەرەکەتان بە سزایەکی زۆر توند ان بکرێ . . پاشا سێ کۆسەکەی نارده دەرەوەو نارنجێکی هێنا لەژێر ئەو مانوورەدا شاردیەوە کە لەسەری دانیشتبوو ، ئنجا بانگی ژوورەوەی کردنو رووی لێ نان

که شتێکی شاردۆتەوە بزانن ئەو شتە چی‌یە ..
یەکەمیان چەند جارێك سەری باداو گوتی هۆۆ هۆ.
دووەم گوتی : خرە وەکو گۆ.
سێیەم گوتی : ترشە وەکو دۆ .
یەکەم گوتی : یـان نارنجە یـان لیمۆ .

پاشا کە ئەمەی دی دەسەر مام رەمەزانی کرد ، مام رەمەزان چـوو لە ئاخوڕی کایان پارەکەی دەرهێناو بۆی هێناوەو ئەوازۆی خواستەوە کە بەو پارەیە سیلێکی بە دوو قران کریـوە ..

هەرچی‌و چۆنێك بێ ئەم ئەفسانەیە سەرتا بەخوار هەمووی سەرواداروەو هەمـوو هەڵویستەکانی بە ( انە ) کۆتایی هاتووە ، ئەوانەی بەم دوایی‌یەش بە ( ۆ ) کۆتایی‌یان هـاتووە .

بەکورتی سەروادار دوو جۆرە :-
یەکەم : سەرواداری کورت .
دووەم : سەرواداری درێژ .

زۆربەی رەوانبێژی زاناکان باوەڕیان وایە کە سـەرواداری کـورت ئەوەیە کە هەر هەڵویستێك لە هەڵویستەکانی ژمارەی ووشەکانی لە ( دە ) رەت نەکا ، خۆ ئەگەر لە ( دە ) رەت بوو ئەوا دەبێ بە سـەرواداری درێژ . بەڵام بەلای منەوە دەبێ سەرواداری کورت‌و درێژ بەهۆی بڕگەوە دیار بکرین نەك ووشـە ، چونکە بۆی هەیە دوو هەڵویست ژمارەی ووشەکانیان هەندی یەك بێ بەڵام ووشەکانی یەکێکیان لە ووشەکانی ئەوەی تر درێژتربن، بۆیە باشترین رێگا بۆ ناسینی سەرواداری کورت‌و درێژ ئەوەیە کە بە بڕگە بکێشرێ‌و بەلای منەوە سـەرواداری کـورت ئەوەیە ژمارەی بڕگەی هەڵویستەکانی لە ( ١٠ ) بڕگە پتر نەبێ ، وە سـەرواداری درێژ

ئەوەیە ژمارەی بڕگەی هەڵویستەکانی لە ( ١٠ ) بڕگە پتر بێ .

## سەرواداری کورت وەکو :

« دووی زەق ، دووی لەق ، دووی رەق ، چاری چەق . »

سێ هەڵویستەکەی بەرایی یەکەو دوو بڕگەن بەلام چوارەمی سێ بڕگەیە . یاوەکو :ـ

« سەری قەسپە ، ملی هەسپە ، کلکی دارە ، پێی مشارە »

هەریەکە لەم هەڵویستانە چوار بڕگەیە .

یا ( علاءالدین سجادی ) دەڵێ :

« رەندو دێوانەو قەلەندەر ، خواناسو پارێزکارو هەردەکەر »

یەکەم هەڵویست ( ٨ ) بڕگەیەو دووەم هەڵویست ( ١٠ ) بڕگ

( سەرواداری درێژ ) یش وەکو مامۆستا سجادی دەڵی :ـ

« کڵپەو کرەی دەروونی لە شۆڕی عەشـــقەوە کێوێکی نـاگرین کەو ئەوای زەبوونی لەبەشقی شەوقەوە بلوێرێکی ئاسنین . »

یەکەم ( ١٩ ) بڕگەیە ، دووەم ( ٢٠ ) بڕگەیە .

سەروادار کورت بێ یا درێژ بە تێکرایی دەکرێ بە سێ بەشەوە

یەکەم : ئەوەیە هەردوو هەڵویستەکە لەبارەی کێشەوە وەکـو یەك بن و ژمارەی بڕگەیان هەندی یەك بێ ، خۆ دیارە هەردووکیشیان لەـ یەك سەروا دەڕۆن . جا دیارە بەشی یەکەم ئەوەیە ئەو هەڵویستا بەر ئەم جۆرە سەرواداره دەکەون لە بارەی کێشو سـەرواوە ێ بکرێنەوە . وەکو :

( تەپ لەسەر تەپی ، دەست لەناو رەپی )

ئەم دوو هەڵویستە کێشو سەوایان یەکە .

یا وەکو ( علاءالدین سجادی ) دەڵێ :

« پابەندیووردی مەعنا بە هەمــوو هێزێکیەوە ، دڵبەندی پیرۆ
قسە بە هەموو ئینێکیەوە . . »

ئەم دوو هەڵویستە هەردووکیان ( ١٤ ) بڕگەیین ، هەردووکیشیان
سەروایان بە ( ێیکەوە ) هاتۆتەوە .

دووەم : ئەوەیە کە دوو هەڵویستەکە یا هەموو هەڵویستەکان لەسەر یەك
کێش نەڕۆن ، کێشیان جودابێ ، هەڵویستی یەکەم لە هەڵویستی
دووەم کورت تر بێ بەڵام نابێ ئەم کورتی‌یە ئەوەنــدە زۆر بێ
کە سەرواداڕەکە دزێو بکا . . وەکو :

« هەورۆکە ، لێی دەبارێ بەفرۆکە . »

هەڵویستی یەکەم کە ســێ بڕگەیە کەمترە لە هەڵویستی دووەم کە
( ٧ ) بڕگەیە .

سێیەم : ئەوەیە کە کێشی هەڵویستەکان یەك نەبێت ، هەڵویستی دووەم لە
هەڵویستی یەکەم کورت تر بێ . ( علاءالدین سجادی ) ئەڵێ :ـ

« هەندێ قسەی ڕەوانو کەوارا وەکو ئاوی ساف ، هەندێ ووتەی
ڕەقو قایم وەکو تەلیسمی قاف . »

هەڵویستی یەکەم ( ١٥ ) بڕگەیە ، دووەم ( ١٤ ) بڕگەیە ، واتە
دووەمیان لە یەکەمیان کورت ترە . . دیسان دەڵێ :ـ

« وەفا نەبوو کەتۆ لە دیاری کامەرانی چاوی نەڕێژیت ، لە بازاری
ژیانا بەرگێ نەپۆشیت ، لە ناو یارانا بڕێ نەبەخشیت . . »

ئەمەیان سێ هەڵویستە ، یەکەم ( ١٨ ) بڕگەیە ، دووەم ( ١٢ )
بڕگەیە ، سێیەم ( ١٠ ) بڕگەیە ، چۆن دووەم لە یەکەم کەمترە ،
ئاواش سێیەم لە دووەم کەمترە ، تا هاتووە هەڵویستەکان کورت بوونەوە .

## ـ دابەش کردنێکی تری سەروادار ـ

پێش ئێستا دوو جار سەروادارمان دابەش کرد ، جارێك بۆ سەرواداری کورت‌و سەرواداری درێژ ، جاریکی تریش بۆ ئەو سەوادارەی کێشی هەڵویستەکانی هەندی یەك بێ‌و ئەوەی هەڵویستی یەکەمی لە دووەم کورت تر بێ‌و ئەوەی هەڵویستی دووەمی لە یەکەم کورت تر بێ ، ئێستاش بە جۆرێکی‌تر دەکەینە سێ بەش :ـ

١ ـ سەرواداری هاوسەر : ئەوەیە کە هەڵویستەکان سەروایان یەك بێ بەڵام کێشیان یەك نەبێ ، جا یەکەم لە دووەم کەمتر بێ یا دووەم لە یەکەم کەمتر بێ گرنگ نی‌یە ، گرنگ ئەوەیە کێشیان جوداو سەروایان یەك بێ . . مامۆستا ( سجادی ) دەڵێ :

« کاهێ لالەزاری زەوی بارەگای بووە ، کاهی جریوەی ئەستێرەی ئاسمان شەو چرای بووە . » ئەم دوو هەڵویستە سەروایان یەکە کێشیان یەك نی‌یە .

٢ ـ سەرواداری دارژراو : ئەوەیە هەڵویستەکان کێش‌و سەروای گشتی‌یان یەك بێ سەرەرای ئەمەش زۆربەی ووشەکانی هەڵویستی یەکە. لەگەل ووشەکانی هەڵویستی دووەم تەن بەتەن هاوکێش‌و هاوسەروا بێ مامۆستا ( سجادی ) دەڵێ :ـ

« سەرخۆشی مەیخانەی ئاهەنگی زەرپۆشان ، دەنك خۆشی نەیخانەی یەك رەنگی مەی نۆشان » .

ئەم دوو هەڵویستە سەروایان یەکە ( ۆشان ) ، کێشیشیان یەکە هەریەکەیان ( ١٢ ) برگەیە ، جگە لەمەش ووشەی « سەرخۆشی دەنك خۆشی » هەر وەها ووشەی « مەیخانەی ـ نەیخانەی » وە ووشەی « ئاهەنگی ـ یەك رەنگی» و ووشەی « زەرپۆشان ـ مەی نۆشان » لە

دوو هەلویستەدا بەکێش‌و سەرواوە بەرامبەر یەك دەوەستن .

٢ ـ سەروادری هاوڕوو : ئەوەش وا دەبێ دوو هەلویست یا پتر بە شوێن یەکدا بێن‌و ووشەی کۆتایی یان لە بارەی کێش‌و سەرواوە وەکو یەك بێ بەبێ چاو دانە بەشەکانی تری هەلویستەکان . مامۆستا ( سجادی ) دەڵێ :

« خەرمانی ژیری‌و دانایی ، یووبە هاوڕازی نوکتە ێنژی دەریای زانایی » هەلویستی یەکەم بە ووشەی ( دانایی ) براوەتەوە ، هەلویستی دووەمیش بە ووشەی ( زانایی ) کۆتایی هاتووە ، ئەم دوو ووشەیەش « دانایی ـ زانایی » کە لە کۆتایی هەردوو هەلویستەکەدا هاتوون لە کێش‌و سەروادا یەك شتن ، بکرە ڕەگەز دۆزیشیان لێ دەکەوێتەوە . .

## کەرت کردن

لە پێشەوە باسی سەروادارمان کردو دەرمان خست کە سەروادار بە زۆر لە پەخشاندا هەیە بەڵام لە گەل ئەوەشدا زۆر جار سەروادار دەستی دەکاتە کەردنی هۆنراوە وە دەیرازێنێتەوە ، واتە هۆنەر پێجگە لە سەروای کشتی هۆنراوەکەی لە کاتی هۆنینەوەی هۆنراوەدا سەروادار بەکار دێنێ و ئەم هونەرەش پێی دەگوترێ ( کەرت کردن ) چونکە لە بەر سەروادارەکانەوە وا دەر دەکەوێ کە هۆنراوەکە کەرت کەرت کرابێ . زیوەر دەڵێ :—

به توندوتیژی هاتە پێشەوە هێتلەر بەڵام دوایی
پەتی پچرا ، هیوای برا ، دەنی دڕا ، ئەما چاری

سەروادار لەم هۆنراوەدا لە نێوانی هەلوێنەکانی « پەتی پچرا ، هیوای برا ، دەنی دڕا » دا هەیە .

کەرت کردن لە هۆنراوەدا گەلێ شێوەی هەیە لەمانە هەندێکیان بۆ

نموونه باس دەکەین :—

١ ـ وا دەبێ هۆنراوەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی بەیەك جۆرو لە سەر یەك کێش کەرت بکرێ و هەر نیوە هۆنراوەیەك یا هەر سێ چوار هەڵوێست پێکەوە سەروایەك دروست بکەن ، هۆنراوە بەناو بانگەکەی ( مەلای جەزیری ) — من دی سەحەر — باشترین نموونەو بەڵگەیە بۆ ئەم قسەیەمان کە دەڵێ :—

من دی سەحەر ، شاهی مەجەر ، لەبسێ ذەبەر ، مەخموور بوو
ئەودیم زەری ، سوورموشتەری ، یارب پەری ، یا حوور بوو
حۆری وەشە ، شرین مەشە ، کاکۆل ڕەشە ، خال حەبەشە
خالێن دقەر ، مسکی تەتەر ، نازك بەشەر ، کافوور بوو
نازك لەتیف ، کەردن خەنیف ، لە بسێ شەریف ، کیخمەو قەدیف
من دی بەوەخت ، ئەونیك بەخت ، نیرۆ لە تەخت ، مەغفوور بوو

ئەم هۆنراوە بەرزەیە لە سەرەتاو تابنەتا هەمووی لە سەر یەك جۆر دەڕوا ، هەر دێرێکی دابەش ( ٨ ) هەڵوێست کراوە ، هەر هەڵوێستی چوار برگەیە ، بێجگە لە سەروای کشتی هەموو هۆنراوەکەش هەموو کەرتەکانی هەر نیوە هۆنراوەیەك سەروایەکی سەر بەخۆیان هەیە .

٢ ـ ولدەبێ کە هۆنەر کەرت کردنەکە بەرێك و پێکی نەکات و لە دێرە هۆنراوەیەك دا هەندێ هەڵوێستی سەروادار بێنێ و بەس وەکو ( زیوەر ) دەڵێ :—

بە توندو تیژی هاتە پێشەوە هێتلەر بەلام دوایی
پەتی پچڕا ، هیوای بڕا ، دەفی دڕا ، ئەمما چاری

دیلرە کەرت کردن تەنیا لە نیوەی دووەمە ، کە سێ هەڵوێستی سەروادارى لێ پێك هێنراوەو بەس « پەتی پچڕا ، هیوای بڕا ، دەفی دڕا » ئەمەشیان

وا نەبێ لە دێڕەکانی تریش دا هاتبێ بەڵکو هەر تەنیا لەم نیوەیە دا هاتووە و هیچی تر .

٣ ـ وا دەبێ کە هۆنەر هۆنراوەیەك دابنێ و هەر دێڕێکی بکاتە چوار کەرت و هەر سێ کەرتی بەرایی پێکەوە سەراوێەکیان هەبێت و دوا کەرتی هەر دێڕێکیش لە گەڵ دوا کەرتی دێڕەکانی تر سەرواى گشتی هۆنراوەکە پێك بێنێ ، ئەمەشیان لە هۆنراوەی کوردی دا گەلێ زۆرە .

نالی دەڵێ :ـــ

سەر بەردەبازی رێتە ، تەن تەختەبەندی جێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە ، روح مالی خۆتە پێبە
شاهێنی دیدەبازە ، مەستی شەرابی نازە
دلدارو دڵنەوازە ، دڵکێش و دڵفریبە

## — گێڕانەوە —

گێڕانەوە :ـــ ئەوەیە کە ووشەیەك یا رستەیەك یا دەستەواژەیەك بێنی کە بە مانایەکی تایبەتی‌یەوە بەسترابێتەوە ، پاشان دووبارە هەمان ووشە یا رستە یا دەستەواژە بێنیتەوە بەڵام ئەمجارە پەیوەندی بەشتێکی ترەوە هەبێت . ( ئەدەب ) دەڵێ :ـــ

لێوکوڵی ، طلعت کوڵی ، روومەت کووڵی ، روخسار کوڵ
کوڵ عوزاری ، نازداری ، دڵشکاوی خوسەرم
کەر عقابە هەر بەسە ، نازە بەسە ، جەووڕە بەسە
وا بکە ئاخر چاوەکەم ئەمنیش بە بارێ دەر بەرم

لە نیوەی یەکەم چوار جار ووشەی ( کوڵ ) ی هێناوە ، هەر جارەی بە شتێکەوە بەستراوە ، یەکەم بە لێو ، دووەم بە طلعت ، سێیەم بە روومەت ، چوارەم بە روخسار . بەم جۆرە چوار جار ووشەی ( کوڵ ) ی

گێڕاوەتەوە و هەر جارەی بۆ شتێکی گێڕاوەتەوە هەر وەها لە نیوەی یەکەمی دێری دووەم سێ جار ووشەی ( بەسە ) ی گێڕاوەتەوە ، ئەوەندە هەیە هەر جارەی ئەم ( بەسە ) بۆ شتێکە ، جارێك بۆ ( عقابە ) و جارێکی تر بۆ ( تازە ) و جارێکی تریش بۆ ( جەورە ) . . .

هەر وەها هەژار دەڵێ :—

بەژن شۆڕ و کەزی شۆڕ و خەزێنم شۆڕ
سەرەو شۆڕم دەکەن ، سەر شۆڕ بەرەو گۆڕ
هەژارو خوارو لەش بیمارو دلدار
دەبا وام لێ بێ مافی خۆمە هەی کۆڕ

زۆر جار ووشەی ( شۆڕ ) هاتووە ، هەر جارێکیش پەیوەندی بە شتێکی تایبەتی یەوە هەیە .

وا دەبێ کە هۆنەر - شاعر - پارچە هۆنراوەیەك بهونێتەو لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە هەموو دێرێك ووشەیێك بکرێتەوە و ئەوەندە هەیە دەبێ هەر جارێك لە گەڵ شتێکی تازە دا بیگونجێنێ و بەویوە بەستێتەوە . وەکو ئەم پارچە هۆنراوەی [ زیوەر ] کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی ووشەی [ درۆیە ] ی لە هەموو دێرەکان گێڕاومتەوە کە دەڵێ :—

بڵێیەی خەرمەنی دەولەت درۆیە
شەوارەی مەزرەعەی سەروەت درۆیە
بجم بێ صداقت مانگە یا رۆژ
ئەما مەعنای شەوی زولمەت درۆیە (١)

## — هێنانەوە —

هێنانەوە لە هۆنراوەو لە پەخشان دا دەبێت ، بریتی یە لەوەی کە هۆنەر یا نووسەر ووشەیەك لە سەرەتا یا لە ناوەڕاستی هەڵوێست یا دێڕ

[١] بۆ ئەم هۆنراوەیە سەیرێکی دیوانی زیوەر بکە ل ٢٥ / ٢٦

هۆنراوەیەك بێنی پاشان هەمان ووشە لە کۆتایی هەلوێستەکە یا دێرە هۆنراوەکە بێنێتەوە . وەکو :—

« سوار تا نەکلێ نابێ بە سوار . »

ووشەی [ سوار ] لە سەرەتای رستەکە هاتووەو لە دوابەندیش هاتۆتەوە .

نالی دەڵێ :—

شەوی یەلدایە یا دەیجوورە ئەم شەو
کەدەیدەم دوور لە تۆ بێ نوورە ئەم شەو

( شەو ) کە لە سەرەتا و بنەتای نیوەی یەکەم هاتووە ، لە دوابەندی هۆنراوەکەش هاتۆتەوە .

ئەم ووشەیەی کە جارێك دێتو دووبارە لە کۆتایی‌یەوە دەهێنرێتەوە سێ جۆر دەبێ :—

١ ـ یا واد بێ ئەم ووشەیەی کە دوابەندی پێ دێتەوە هەر هەمان ووشەکەی بەرایی بێتو دووپات بوویێتەوە ، نەشێوەو نەماناشی نەگۆڕابێ . نالی دەڵێ :—

فەرقی کوڕو کچ رەوشەن وەك فەرقی مەهو مەهرە
وەك فەرقی شەو و ڕۆژە ئەم فەرقە لە کوڕ تا کچ

ووشەی ( کچ ) لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەم هاتووە ، لە کۆتایی هۆنراوەکەش هاتۆتەوە ، کە هاتۆتەوەش هەر ووشەی جاری یەکەمە دووپات کراوەتەوە و هەر مانای ئەو دەدات .

٢ ـ یا وادەبێ ئەم دوو ووشەیە لە شێوەو رواڵەت دا یەك بێ بەڵام هەر یەکەیان واتایەك بدا بە دەستەوە ، واتە رەگەزدۆزی‌یان لە نێوان دا هەبێ . حاجی قادری کۆیی دەڵێ :—

ئەگەر خاڵت بڵێم مشکی خەتایە
عەزیزی من ئەمەم عەینی خەتایە

( خەتایە ) کە لە کۆتایی نیوەی یەکەم هاتووە ، لە کۆتایی دێرە هۆنراوەکەش هاتۆتەوە ، کە هاتۆتەوەش وەنەبێ هەمان شت بێ‌و دووپات بوبێتەوە و هەمان مانا رابگەیەنێ بەلکو هەر جارەی مانایەك دەدات ، ( خەتا ) ی جاری یەکەم ناوی شوێنێکە لە ناوەراستی ئاسیا بە ئاسکی مسك دار بە ناوبانگە جاری دووەمیش مانای سووچ‌و تاوان دەدات

بەمەوەش رەگەز دزی‌یان لە نێوان پەیدا بووە چونکە لە روالەتدا یەك شتن‌و لەماناش‌دا جودان .

٣ ـ یا وا دەبێ کە دوو ووشەکە کت‌و مت یەك نەبن ، بەلام رەگەزو بنەرەتیان یەك بێت‌و لەیەك رەگەوە وەرگیرابن . . نالی دەلێ :

ئەو گەوهەری نیکتەی کە لە نالی دەدزن خەلق
ئاوی نی‌یە وەك ئاگری بێ شەوقی دزانە

( دەدزن ) کە لەناوەراستی نیوەی یەکەم هاتووەو ( دزانە ) کە لە کۆتایی هۆنراوەکە هاتۆتەوە ، یەك شت نین ، یەکەمیان کردارەو کرداری رانەبوردووە ، دووەمیان ناوی کۆیە . هەردووکیان لەیەك رەگ وەرگیراون

ئێستا باسی هێنانەوەو شوێنی ووشەکان لە هۆنراوەدا دەکەین ، ئێمە کوتمان هێنانەوە ئەوەیە ووشەیەك لە سەرەتا یا لە ناوەراستی دێر هۆنراوەیەك بێ پاشان هەمان ووشە لەکۆتایی دێرە هۆنراوەکە دووبار بێتەوە . کەواتە هەر دەبێ ووشەی دووەم لە کۆتایی دێرە هۆنراوەکەو بێت ، دەمێنێتەوە سەر ووشەی یەکەم ، ئەویش لەیەکێ لەم شوێنانە دێت :

١ ـ وا دەبێ ووشەکە بکەوێتە سەرەتای هۆنراوەکە . نالی دەلی :

شەوبۆی سەری سونبولی زولفت لە سەری دام
ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەی شەوبۆ

٢ ـ یا وا دەبێ ووشەکە بکەوێتە ناوەراستی نیوەی یەکەمی دێر هۆنراوەکە ( کەمالی ) دەلێ :

ئەگەر شیرین دەمێکی چەشنی تۆ بیوایە ئەم چەرخە
مەحالە چۆن ئەبوو فەرهادی بێ کەس عاشقی شیرین

٣ ـ یا وا دەبێ ووشـــەی یەکـەم لەکۆتـایی نیوە دێری یەکـەم بێت ( ئەدەب ) دەڵێ :ـ

بۆ ئەو کەسە عیشقی بێ فەرقی نی‌یە کوڕ یا کچ
هەر چەندە کە مەعلومە فەرقی نی‌یە کوڕ یا کچ

٤ ـ یا وا دەبێ ووشـــەی یەکـەم لە سـەرەتای نیـوەی دووەمی دێرە هۆنراوەکەدا بێ ؛ حاجی دەڵێ :

چوومە پارێزی کە مۆژگانی برۆم دی ئـەو کەمین
تیری من یوو بە کەمان ، پشتی کەمان بووە تیر .



ج

# « پـــات کردنـەوە »

ئەوەیە هۆنەر یا نووسەر ، ووشەیەك یا دەستەواژەیەك یـا رستەیەك بێنێو چـــەند جارێك پاتی بکاتەوە ، بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی ، بە مەرجەی هەموویان واتایان یەك بێتو لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر واتایان نەگۆڕێ ، واتـە : نـابێ ووشەکان نە لە ڕواڵەتو نە لە گوزارەدا هیچ گۆڕانیـان بە سەردا بێت . مەلا محمدی کۆیی دەڵی :

ژیـانی وا بـە نـالامو بـە میحنـــەت
بە لەعنەت بێ بە لەعنەت بێ بە لەعنەت

ووشەی ( لەعنەت ) سێ جار هاتووە ، هەموویان واتایان یەکە پـات کردنەوەکەش خزمەتی دەربڕینی ئەم داخو کەسەرە دەکا کە شـاعـ بەرامبەر بە ئێشو ئازارو ناخۆشی ژیان لە دڵو دەروونیدا پەیدا بووە کاکەی ئەلاح دەڵێ :

ئەی تەمی ڕەش ، ئەی بادەی خەم نازانم بۆ نازانم بۆ -
وا دام ئەگـری دێتو ئەچی ناکـەم لە تۆ ناکەم لە تۆ

( نازانم بۆ ناکەم لە تۆ ) ی دووپات کردۆتەوە .

هۆنەر یا نووسەر کە ووشەیەك یا چەند ووشەیەك دووپات یا سێ پا دەکاتەوە ، دەبێ مەبەستێکی لەم پات کردنەوەدا هەبێ یا خۆیشی نـاکـ ڕاستەوخۆی لە مەبەستەکە نەبێو سۆزی هەڵچووی دەروونو هەستی کەر هەناوی وایان لێ کردبێ کە شتەکە دووپاتو سێ پات بکاتەوە . . ئەوە هەندێ لەو مەبەستانە :-

١ - بۆ چەسپاندنی واتاکە لە مێشکی گوێگرو بردنە دڵیەوە :

گۆران دەڵێ :—

فەرمانێ ئەی کۆمەڵ ! فەرمانێ ! فەرمانێ !
بـــــۆ دەردی بێ کاری چارەیەك دەرمانێ !

[ گۆران ] پڕ بەدەم هاواری ئەم کۆمەڵە دەکات بـۆ فەرمانێك ، بـۆ دۆزینەوەی داو و دەرمانێك بۆ دەردی بێ کاری ، جا بۆ ئەوەی تـەکەی کار بکات و خوێنەر بهەژێنێ و ئاگاداری کارەساتی بێ کاری بکات و هانی بـدات تا بە دوای دۆزینەوەی کاردا بکەڕێ ، هـاتووە سێ جـار ووشەی [ فەرمانێ ] دەڵێتەوە ، کە سێ جاریش دەیڵێتەوە هەر بۆ ئەوەیە گوێگر رابکێشێ و شتە مەبەستەکەی بیاتە دڵەوە . . یا وەکو نالی دەڵێ :ـ

بحمدالله دووچاوی یـــــــارم ئـــۆخەی
بە بێ مەی مەستی بێ مەی مەستی بێ مەی
لـە بـوستانی ئیرەم دا قـــــەت نییە وەك
شەمـامەی وەك شەمـامەی وەك شەمـامەی

نیوەی دووەمی هەر دێرە هۆنراوەیەك لەم هۆنراوەی سەرەوەدا بریتییە لە دووپات و سێپات کردنەوەی چەند ووشەیەك ، بـەڕاستی ئەم پارچە هۆنراوەیە نمونەیەکی زۆر پڕ سۆزە و نیشانەی هونەرمەندیو وەستایەتیو شارەزایییە . . دارشتنو هێنان و پاتەکردنەوەی وا جوانو لە جێ و بە تەنـیـ مەگەر هەر لە قەڵەمی رەنگینی وەستایەکی وەك مەلا خدری نـالی بوەشێتەوە .

٢ ـ بۆ پێشاندانی داخو خەفەتو پەرۆشی .

گۆران دەڵێ :ـ

تاقە تروسکەی وەجاخێ بوو ئاخ تاقە نەمامی ناو باخێ بوو ئاخ

ووشەی [ ئاخ ] خۆی بۆ دەربڕین و پیشاندانی خەم و ماتەمێ و ئێش و کەسەری دڵ بەکاردێ [ گۆران ] ئەم ووشەیەی دوو جار هێناوە .

دووپات‌کردنه‌وه‌که‌شی هه‌ر بۆ ده‌ربڕینی راده‌ی داخ و حه‌سرەتی ده‌روونی‌یه‌تی .

٣ ـ بۆ دامه‌زراندنی کێشی هۆنراوه : (١)

زۆر جار هۆنه‌ر له سه‌ره‌تای پارچه هۆنراوه‌که‌ی دا چه‌ند ووشه‌یه‌ک یا نیو دێر دووپات ده‌کاته‌وه ، ئه‌مه‌شیان هه‌ر بۆ ئه‌وه‌یه تا هه‌ستی ده‌روونی بکه‌وێته رێژکه‌ی ئـه‌و کێشه‌وه که ده‌یه‌وێ هـه‌سته‌که‌ی پێ ده‌ر بڕێ، هه‌ر وه‌ها بۆ ئه‌وه‌ی خۆ ئاماده‌کردنێکی ده‌روونی بـۆ په‌یدا بێ و رێگه به‌رده‌می ته‌خت بێ و زنجیره‌ی هۆنراوه‌که بـه نــــه‌رم و لـووسی ؛

---

(١) عه‌ره‌به‌کانیش ئه‌ده‌بی کلاسیکی‌یان شتی وای زۆر تێدایه و زۆر ـ هۆنه‌ر له سه‌رتای هۆنراوه‌که‌ی‌دا هه‌ندێ ووشه دووپات ده‌کاته‌وه تا جۆ کێفه‌که‌ی بۆ مل که‌چ بێ‌و بیخاته بن رکێفی خۆیه‌وه . وه‌کو :ـ

ومن من ومن من ثم من ‌من ومن          ومن وجنتی سلمی أقبل لم أ

یا وه‌کو :ـ

وکم‌کم وکم‌کم ثم‌کم‌کم وکم وکم          اسائل عنها کل من راح وار

یاخود وه‌کو [ نعم لا ] که ده‌ڵێن [ خه‌لیل ] به بنه‌ره‌تی زانیاری عه‌رو داناوه .

وه‌کو له عه‌ره‌بی‌دا هه‌یه ، له ئینگلیزیش ئه‌م جوره شته هه‌یه ئه‌وه‌تا [ درایدن dryden ] له نامه‌نکی ئه‌سکه‌نده‌ردا ده‌ڵێ :ـ

Fallen Fallen Fallen Fallen
Fallen from his high state
and welteriag in his blood .

خوارەوە . سەلام دەڵێ :

تۆزێ لەنجەولار　　　تۆزێ لەنجەولار
ناسك و نازدار　　　تۆزێ لەنجەولار

لەم دێرەی سەرەتادا سێ جار ( تۆزێ لەنجەولار ) هاتووە ، ئەوەش هەر بۆ ئەوەیە کە کێشی هۆنراوەکەی بۆ بکرێتەوە وسۆزی مەناوی هەڵبڕژێتەو تێکەڵ کێشەکە بێ .

٤ ـ بۆ بڕینەوەی هۆنراوەو بەجێ هێشتنی کاریکەرێکی بەهێز :

زۆر جار وا دەبێ هۆنەر لە کۆتایی هونراوەکەیدا ووشەیەك یا چەند ووشەیەك چەند جارێك دەڵێتەوە ، بۆ ئەوەی شەوت و تەنـیـی ئەم دووپات کردنەوەیە لە دڵ و دەروونی گوێگر بزرنگێتەوەو سەدای هـەر بمێنێ ئەو کاتەی کە هۆنراوەکە بەجێ دێڵێ ، ئەمەشیان بە تایبەتی لە شیعری هاوچاخدا هەستی پێ دەکرێو لە شیعری کلاسیکیدا کەمتر دەست دەکەوت . . وەکو شێرکۆ بێکەس دەڵێ :ـ

ئێمەش خاکی سك سووتاومان . .
پێتی داخ کراوی ناومان
جێ ناهێڵین
جێ ناهێڵین

کە لـــە کۆتایی هۆنراوەکەدا [ جێ ناهێڵین ] دووپـات دەکاتەوە ، بۆ ئەوەیەتی کاریکەری ئەم جێنەهێشتنە لە دڵی گوێگر یا خوێنەر دا دەنگ بداتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر هەر بمێنێ .

٥ - بۆ داکرتنی هەموو لایەنێکی شتە باسکراوەکە :

سەلام دەڵێ :

رۆژێ ڕاوکەرێ بـۆ ڕاووشکار
وورد وورد ئەگەڕا بنّدار بە بنّدار

کە دەڵێ [ بن دار بە بنّدار ] ماناى وایە یەکە یەکە پێدا هاتووە و بن دارەکانى پشکنیوە و هیچێکیانى بازنـەداوە و پشکنینەکە هـەموو دارەکانى گرتۆتەوە . . دیـسان دەڵێ :

حقووقى ئەومى یەك یەك بپرسێ        لە کەس نەترسێ کە

دەڵێ ( یەك یەك بپـــرسێ ) ماناى وایـــە پرسینەکـە هەموو کەسێ بگرێتەوە و کەس نەبێتە لاوە .

* * *

## — تێهـەڵکێش —

تێهەڵکێش ئەوەیە کە هۆنەر یا نووسەر نیو دێرە هۆنراوە یا دێرە هۆنراوەیەك یا پارچە هۆنراوەیەکی تەواوی هۆنەرێکی تر بێنی و لە نووسین یا هۆنراوەکەی خۆی هەڵبکێشێ و پێی برازێنێتەوە .

علی کمال باپیر دەڵێ :

مانگ ئەوا گیرا وەکو حەمدی ئەڵێ تا بەر ئەبێ
« هەر لە تەشتی سینەیی زامارو تەپڵی سەر ئەدەم »

دیارە ـ کەمالی ـ یاری لە بەر چاو وون بووە ، چونکە ئەو یارەش وەك مانگ وایە بۆ ئەو ، بۆیە وون بوونی یاریەکەی بە مانگ گیران چواندوە جا کە بزربوونی یارەکەی مانگێك بێ و گیرابێ دەبێ ئیشێکی وا بکات کە مانگەکە بەری بەر بدرێ و دەربکەوێتەوە ، بۆ ئەمەش بە دوای چارەیەکدا دەگەرێ و چارەکەش لە نیودێرە هۆنراوەی [ حەمدی ] بەدی دەکات و خێرا پەنای دەباتە بەرو وەری دەگرێ و ماناو مەبەستەکەی دلی خۆی پێ تەواو دەکاو دەڵێ هەر لەتەشتی سینگ وتەپڵی سەر دەدەم تا مانگەکە بەر دەبێ .

[ حەمدی ] لە نیو دێرە هۆنراوەکەیدا رەوشتێکی کۆنی کورد،وارێمان یاد دەخاتەوە ، کە وابوو لە کاتی مانگ گیراندا خەڵکی دەستیان دەکرد بە تەپڵ و دەف لێدان بۆ ئەوەی مانگەکە بەر بێ ، چونکە باوەڕیان وا بوو کە لە کاتی مانگ گیراندا دێوێکی زۆر گەورە هەیە دێتە بەر مانگ‌و نایەڵێ تریفەی ئەو مانگە بەم خەڵکە بکات ، جا بۆ ئەوەی دێوکە بترسێنن وەرای‌بەرێنن‌و لە سەر مانگی لا بدەن دەهاتن پۆل پۆل دەستیان بە تەپڵ کوتان‌و دەف لێدان دەکرد تا مانگ بەر نەبوایە وازیان نەهێنا . .

جا کەمالی دەڵێ چۆن لە کاتی مانگ گیراندا خەڵکی دەکەونــە دەنگدان و تەپڵ کوتان و تا مانگیان لێ دەرنەکەوێتەوە واز ناهێنن ، منیش هەر بەم جۆرە کە خۆشەویستەکەم لـە بەر چاو بزربوە هــەر لە تەپڵی سەر و سینگی بریندارم دەدەم و واز لە شین و شەپۆر ناهێنم تا یارەکەم لێ بەدەر نەکەوێتەوە و دڵم بە تریفەی جوانییا ڕۆشن نەبێتەوە .

تێهەڵکێش دوو جۆرە :

١ — وا دەبێ هۆنەر یـا نووسـەر لە کاتی وەرگرتن و تێهەڵکێش کردنی هۆنراوەیەك ناوی هۆنەرە لێ وەرگیراوەکەش بیات . وەکو پیرەمێرد دێڕە هۆنراوەیەکی ( مەولەوی ) تێهەڵکێش دەکات و دەیخاتە ناو ( تاقگەی زەڵم ) ، وەو ناوی خاوەنەکەشی دەبات کە مەولەوی یە :ـ

لـــە دواوان دا کــە یـــەك نەکەوێ
دوو مصرعی بۆ بەیتی مــــــەولەوی
« سەیروانی ئەم چەم تاٌنجەڕۆی ئەو چەم
بدەن بە یەکدا ئەم چەم تا ئەو چەم »

یا وەکو علی کمال باپیر دەڵێ :

بۆ فەلەك ناکەم تنزل هەر وەکو نوری دەڵێ :
« من بە چەرخی ئلسمانی سپلە استهزا ئەکەم »

وەکو چۆن تێهەڵکێش لە هۆنراوەدا دەبێ ئاوا لە پەخشانیش دەبێ . وەکو پیرەمێرد لە ( وەسیەتنامەکەی ) دا دوو هۆنراوەی خۆی تێهەڵکێش کردووە و ناوی خاوەنەکەشی بردووە کە خۆیەتی و بـە ڕاناوی دوتنەری ناك نیشارەتی بۆ خۆی کردووە . . دەڵێ :ـ

«ئامۆژگاریم ئەوەیە بخوێنن ، کوڕ و کچ تا خوێندەوار نەبن بێ سوودە ،

هەمرو شتێك بە علم و فەنەوەیە ، وەكو وتوومە :-

لای من بە خوێندەواریە ، ئـاه خوێندەواری یە
هەر میللەتێ كە فەنی نەبێ دەردی كـــاریە
ئاخ خۆزگە خوێندنیش وەكو من ئارەزووی ئەكەم
بیینم و نەبێتە گرێی تورسی كفنـــــەكەم

ئامۆژكاریم ئەوەیە بە شوێن مـادە مەكەون . . . . . .

٢ ـ یا وادەبێ هۆنەر یا نووسەر لە كاتی وەرگرتن و تێهەلكێش كردنی هۆنراوەیەك ناوی خاوەنەكەی هەر نەبـات ، ئەمەشیان لە بەر ناوداری و زۆر بلاو بوونەوەی هۆنراوەكە . . بۆیە راستەو راست هۆنراوە وەرگیراوەكە لە ریزی هۆنراوەكەی خۆی هەلدەكێشێ ، بەلام ئەوەندە هەیـە هـۆنراوە وەرگیراوەكە دەخاتە نێوان جووت كەوانەوە تا خوێنەر هەر زوو بـزانێ ئەم هۆنراوەیە هی خۆی نی یە و وەرگیراوە ،

علی كمال باپیر دەلێ :

سەیری كە ئەلێی خوێنی رژای كەشی تۆیە
« سیروانی سروشكم كە ئەكا هاژە لەسەردا »

ئەمە دێرە هۆنراوەیەكە بە پارچەیەكی دوور و درێژ ، كەمالی بـە ناوی « شیوەن بۆ شاعیری بە تاوبانگ احمد مختار بەگی عثمانی پاشای جاف » هۆنیوبەتەوە و كلپە و گری دەروونی سووتاوی تیادا دەرێژێ ، لە پـەر پروشكێك لە جەرگی هەلقرچاوی ( طاهر بەگ ) ی برای ( احمد مختار ) بورز دەبێتەوە و لەگەل پروشكە ئاگرینەكانی هەناوی داگیر ساوی كەمالی تێكەل دەبێ‌و هۆنراوەكە گەرمتر دەكات و كاریگەری پتر دەكات . . واتە ـ علی كمال ـ نیودێرە هۆنراوەی طاهر بەگی وەرگرتوە و لە هۆنراوەكەی خۆی هەلكێشـاوەو ناوی خاوەنەكەشی هەر نەبردووە .

# پێنج خشتەکی

باسی تێهەلکێش ناچارمان دەکا کە نــــاوڕێك لە پێنج خشتەکی بدەینەوەو بزانین پێنج خشتەکی چی‌یە و چۆن ئەبێ‌و لە چ سەردەمێك دا باوی هەبووە . پێنج خشتەکی ئەوەیە کە هۆنەر پــــارچە هۆنراوەیەکی هۆنەرێکی تر وەربگرێ‌و هەر دێرێکی سێ نیوە دێری بۆ زیاد بکات ، بەو مەرجەی لە سەر هەمان کێش بێ و سەروای هــــەر سێ نیوەکە لە گەل سەروای نیوەی یەکەمی هۆنراوە وەرگیراوەکە یەك بێت و دیارە سەروای کشتی هۆنراوەکەش هەر دەمێنێ . . بەکورتی چامەکە بەش بەش دەبێت ، هەر بەشەی دەبێتە پێنج نیوە هۆنراوە ، سێ نیوەی بەرایی هی هونەرێکەو دووەکەی دوایش هی هونەرێکی تر . دیـان چوار نیوەی بەرایی لە سەر یەك سەروا دەڕۆن و نیوەی پێنجەم سەروای تایبەتی خۆی دەبێ کــــە لە گەل سەروای کشتی هەموو پێنج خشتەکی‌یە کە تێك دەکاتەوە . .

بۆ نمونە ئەگەر هۆنراوەیەك سەرواکەی [ س ] بێت و هۆنەرێکو تر بێت و ئەم هۆنراوەیە بکاتە پێنج خشتەکی ، دەبێ هــــەر دێرەی سێ نیوە دێری لە سەر هەمان کێشی بخاتە سەرو سەروای هــــەر سێ نیوەش لە گەل سەروای نیوەی یەکەم تێك بکاتەوە ، ئەگــەر ســەروای نیوەدێری یەکەم [ ا ] بێ ، پارچەی یەکەم بەم جۆرە دەبێ .

[ ا ، ا ، ا ، ا ، س ] . وە ئەگەر سەروای یەکەم نیوەی دێری دووەم [ ج ] بێت بــــەم جــــۆرە دەبێ ( ج ، ج ، ج ، ج ، س ) هەروەها ئەگەر سەروای نیوەی یەکەمی دێری سێیەم ( ب ) بێت ، بە جۆرەی لێ دێ : ( ب ، ب ، ب ، ب ، س ) .

وەکو ئەم پێنج خشتەکی‌یەی ( هــــەردی ) کە لــە ســەر هەلبەستێکی شێخ نوری شێخ صالح دایناوە و دەلێ :

ئەت ئەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو
خۆت ئەخەیتە بەر شەپۆلی ئەشکێ بێ پایانی شەو
ئەی کچی خواوەندی جوانی و ئەی چرای دیوانی شەو

هەردی

خۆت بپارێزە لە ئاهی دڵ بریندارانی شەو
ئەک خوا ناکەرد گیرابێ دوعای ناڵانی شەو

شێخ نوری

× × ×

وێڵم و تاریکە دەورم فەرشی رنگەم مەینەتە
بێ کەسم تەنها ئەناڵم مەرگی خۆمم حەزرەتە
سازی ئاهەنگی شەوانم سۆزی جەرگی لەت لەتە

هەردی

یاوەر و یاری ئەنیسم ئاه و ئەشکی حەسرەتە
ئافەرین ئەی بارک الله دیدەیی گریانی شەو

شێخ نوری

× × ×

وا ئەزانی دەستی غەم یادت لە دڵ دا دەرئەکا
ئەشکی خوێنینم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕ نەکا
گیانەکەم بەو تیشکی چاوەی شەڕ لە گەڵ ئەختەر ئەکا

هەردی

دڵ ئەبێتە قەترەێ خوێنێ و لە دیدەم سەر ئەکا
هەرکە رابوورێ بە دڵما سوحبەتی جارانی شەو

شێخ نوری

× × ×

ماودەمی فەرمووی لەبەرچی کردەوەت کریانە هەر
تـــانی لاوبێتە لاوی قەلبـەزەی سەیـــرانە هەر
من ووتم سەیران و خۆشی پێشکەشی شـادانە هەر

هـەردی

ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیا بەختـانە هەر
شەونمی سوبحە دەلیلی قەتـــرەیێك كـریانی شەو

شێخ نوری

× × ×

هـەولی زۆرم دا لە داوی زولفی ئەو بێ مـروەتە
دەرچم و دوایی بهێنم بـەم عـــەزاب و مـەینەتە
پێی ووتم بێ سوودە هـەولت تاکـوماوی جێکەتە

هـەردی

نووری لەم پێنج و خەمی زولفە نەجاتت زەحمەتە
لای سەخی تەبعان مەحالە رەخـــەتی مێوانی شەو

شێخ نوری

بێ‌گومان ئەم هونەرە بە زۆری لە شیعری کلاسیکی کوردیمان د
اوی هەبووە ، بە تایبەتی لە لای شاعیرانی پاش نالی و کوردی و سالم
ە لەو سەردەمیش دا بە زۆری هونەری شیعر لە سەر ئەو بارە بووە ک
کەوتە شێوەی چامەوەو چامەش دیارە بە زۆری لە سەر کێشی عەرووزی
عەرەبی دەڕوات و لە سەرەتا تا کۆتای یەك سەروای هەیەو جگە لەمەش
وەك شیعری کلاسیکی عەرەبی دوو نیوەی یەکەمی هەر چامەیەك سەروایان
یەك بووەکە بریتیە لە سەروای کێشی هۆنراوەکە .

* پێچان و کردنەوە — اللف والنشر
* دژیەك — الطباق
* بەرامبەری — المقابلة
* جێ گۆڕین — التبدیل
* پۆشین — التوریة
* جوانی بایس — حسن التعلیل
* بادانەوە — الرجوع
* راکومکی ئاشنا — تجاهل العارف
* هووشە کاری — المبالغة
* تێلنیشان — التلمیح
* روون کردنەوە — التفسیر
* کۆ کردنەوە — الجمع
* لێك کردنەوە — التفریق
* دابەش کردن — التقسیم

# پێچـانو کردنەوە

ئەوەیە کە ناوی چەند شتێك بە شوێن یەکەوە بێنی و لـە تــەك یەکتریان دابنێی و ئەیەلێ ووشەی تریان بکەوێتە نێوان ، پاشان پێچانەکە بکەوێتەوە ، واتــە چەند ووشەیەکی تــر بێنی کـە پەیوەندیان بە ووشە پێچراوەکانەوە هەبێت و بۆ ئەوان بگەڕێتەوە ، بە بێ ئـەوەی ئەوە دیـار بکەی کە کام ووشە بۆ کام ووشـە دەگەڕێتەوە چـونکە خوێنەر یا گوێگر خۆی توانای ئەوەی هەیە هەر یەکەیان بۆ ئەوە بباتەوە کە پەیوەندی پێوە هەیە . گۆران دەڵێ :

منیش وەك ئێوە لە دونیای گەورە گەردنکمبچووك

هەتا ناشتوانم بفڕم ، بخوێنم ، بەبال ، بـە دەنووك

لە پێش دا ( گۆران ) دوو ووشەی هێناوە « بفڕم ـ بخوێنم » و پێکەوەی پێچاون ، ئینجا هاتووە ئەم پێچانەی کردۆتەوە ، واتە دوو ووشەی تری هێناوە ( بە بال ـ بە دەنووك ) کە ( بال ) بۆ فڕین و ( دەنووك ) بۆ خوێندنەکە دەچێتەوە . . ئەم دوو ووشەیەش ( بـال ـ دەنووك ) هەر بە تەنیشت یەکەوە هاتوون ، بێ ئەوەی ئەوە دەست نیشان بکا کە بـال بۆ فڕین و دەنووك بۆ خوێندنە چونکە خوێنەر یـــا گوێگر خـۆی ئەمە دەزانێ و دەتوانێ هەر یەکەیان بۆ ئەوی تر بباتەوە . ( مەولەوی ) دەڵێ :

گەرمی مەی ، ئەواوگزەی دەف و نەی

تێکەڵ بـوو چەنی زایەڵــەی وەی وەی

مەولەوی لە پێش دا ( ئەواو گزە ) ی هێنــاوە ، پاشان دوو شێ هێناوە کە هـــەر یەکەیان ئـالەتی پەیدابوونی یەکێکـە لـەو دوو دەنگەیە . . ئەوانیش ( دەف و نەی ) ن کە ( نەی ) ئەوای لێ هەڵدەسێ و ( دەف ) گزە .

# — جۆرەکـانی پێچان و کردنەوە —

پێچان و کردنەوە کەلێ جۆری هەیە لەوانە هەندێکیان باس دەکەین :

١ — پێچان و کردنەوەی رێك ، ئەمەیان وا دەبێ کە نووسەر یا هۆنە
چەند ووشەیەك بێنێ و لە تەنیشت یەك ریزیان بکات ، ئنجا دوا بەدوا
ئەوانەوە چەند ووشەیەکی تر بێنێ کە هەر یەکەیان بۆ یەکێ لە ووشەکا
بەرایی بکەرێتەوە و لە هەر دوو جاریش دا ووشەکان لـە سەر یەك ر
برۆن ، واتە ووشەی یەکەم بۆ یەکەم و دووەم بۆ دووەم و سێیەم بۆ س
یەم و . . . . . بکەرێتەوە . نـالی دەلێ :

ئاسمانی حوسنی مەحبوبەم لە ئەبرۆ و زولف و روو
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابـانی هەیـە

لە نیوەی یەکەم سێ ووشەی ( ئەبرۆ ـ زولف ـ روو ) هێناوەو
تەنیشت یەکی پێچـاون ، ئنجا کە دێ ئەم پێچانە بکاتـەوە ، یەک
( لەو چوو ـ مشبەبە ) یان بۆ دێنێ ، لە نیوەی دووەم ئـەم سێ ووش
( دوو هیلال ـ دوو شەو ـ دوو ماهی تابان ) یان بۆ دێنێ ، ئەوەش د
ئاکا کە کلمەیان بۆ کلمە دەکەرێتەوە چونکە لای مـێژکەرە خوێنەر یا گوێ
ئەوەی لە باردا هەیە کە هەر یەکەیان بۆ ئەوە بیانەوە کە پەیوەندی پ
هەیە . . یەکەم کە ( دوو هیلال ) ە بـۆ ووشـەی یەکەم دەچێتـەوە
( ئەبـرۆ ) یـە ، دووەمیش ( دوو شـەو ) بـۆ ووشـەی دووەم ( زولف
دەچێتەوە و سێ یەمیش ( دوو ماهی تابان ) بۆ ووشەی سێ یەم ( رو
دەکەرێتەوە . لێرەدا ئەم ووشانەی کە لە تەك یەك پێچراون و ئەو ووشا
کە پێچانەکەیان پێ کراوەتەوە ، بە یەك جۆر لە تەنیشت یەك ریز کراو

بۆیە ئەم جۆرە پێچانو کردنەوە پێی دەکوترێ ( پێچانو کردنەوەی رێك ) .
( مەنفی ) کوێ بیست بووە کە کوتوویانە : رۆژو مانگی یەکشەوە و مانگی چواردە قەتاو قەت پێکەوە کۆنابنەوە ، کە رۆژ هەبێ مانگ حوکمی نی یە ، کە شەویش بێ دیارە رۆژ بەدەرەوە نی یە و ئەگەر مانگ یەك شەوە بێ دیارە لە هەمان کات دا مانگی چواردە نی یە ، ئەگەر مانگ لە چواردە بێ دیارە لە هەمان کات دا مانگی یەك شەوە نی یە . . ئەمە راستی یەکەو قەت نکولو لالووتی لێ ناکرێ بۆیە ، ئەویش باوەڕی پێ هێناوە و ئەوەی لە دڵ چەسپاوە کە ئەم سێ شتە ( رۆژ ـ مانگی یەك شەوە ـ مانگی چواردە ) قەت پێکەوە کۆنابنەوە . . کەچی کت و پڕ رۆژی رووی یارو هیلالی دوو ئەبرۆکەیو مانگی چواردەی نیو چەوانی پێکەوە لی‌ێ دەرکەوتووەو پێیبڕیە وا هەر سێکیان پێکەوە کۆ بووینەوە ، دەم و دەست لە باوەڕی پێشووی دا بەزیوە و بەك گەیشتنی ئەم سێ شتەی بە شتێکی زۆر ئاسایی زانیوە :ـ

دەڵێن رۆژو هیلال و ماهی چواردە قەت جەمع نابن
لە روو ئەبرۆ و جەبینی یار تەماشا چۆن نمایانە

( رۆژ ـ هیلال ـ ماهی چواردە ) ی هێناوە ، کە هەموویان ( لەوچوو ) ن ، ئنجا بەڕیز ( لێ چوو ـ مشبە ) کانی بۆ هێناون کە ( روو ـ ئەبرۆ ـ جەبینە ) ئەمەشیان کردنەوەیەکی رێکە ، چونکە ( روو ) بە ( رۆژ ) دەچێتو ( ئەبرۆ ) بە ( هیلال ) دەچێت و ( جەبین ) بە ماهی چواردە . .
٢ ــ پێچان و کردنەوەی ناڕێك : ئەوەش وا دەبێ کە لە پێش دا چەند ووشەیەك لە ئەلیشت یەکەوە بێنێ ، ئنجا دوا بە دوای ئەوانەوە چەند ووشەیەکی تر بێنێ کە هەر یەکێکیان پەیوەندی بە یەکێ لە ووشەکانی پێشەوە هەبێت و جۆری ریز کردنی ووشەکانیش لە هەر دوو لادا وەکو

یەك نەبێ ، واتە مەرج نی‌یە لە کاتی کرانەوە دا ووشەی یەکەم بۆ یەك
دووەم بۆ دووەم و سێ‌یەم بۆ سێ‌یەم و . . . بچێتەوە ، بەڵکو هەر ئەوە
هەیە کە بۆ هەر ووشەیەك لە ووشەکانی پێشەوە شتێك دێنن و کوێ بەوە :
کە بەڕیز بیانهێنی . . دلدار دەڵێ :

دل لە بەینی ئەلمەتی روو و زولفەکەی دەبجوورتــە
کــامێ مەیلی شــەو ئەکات و کــامێ مەیلی نوورتـــــە

لە پێشەوە کە ( روو ـ زولف ) ی هێناوە ، ( رووی ) پێش ( زولف
خستووە . بەڵام کە بە لێکچواندن دەیانکاتەوە و ( روو ) بە ( نــوور
( زولف ) بە ( شەو ) دەچوێنێ . . ( شەو ) پێش ( نوور ) دەخا . . و
یەکەم ووشەی کرانەوەکە کە ( شەو ) ە بۆ دووەم ووشەی پێچانا
دەچێتەوە کە ( زولف ) ە و دووەم ووشەش کە ( نوور ) ە بۆ یەکەم دەچێ
کە ( روو ) ە . ئەمیشیان پێ‌ی دەکوترێ ( پێچان و کردنەوەی نارێك
طاهر بەگی جاف دەڵێ :

برۆ و روخسـار و زولفـ و لێوی ئالت
شەو و رۆژ و هیلال و عەقد و مەرجـان

٣ ــ پێچان و کردنەوەی رێك و نارێك .

ئەوەش وا دەبێ کە نووسەر یا هۆنەر چەند ووشەیەك لـە ئەك
بێنن و لەپاتی جارێك دوو جار یا پتر بیان کاتەوە و جاری یەکەم کرد
کە بە رێکی بێت و جاری دووەم بە نارێکی . . وەفایی دەڵێ :

مـن پەرێشانم لە بەر زولفت بە روو دا کەوتووم
زولف و رووی تۆ سونبول و گول یا کەنوور و زولمەتە

لە نیوەی دووەم وەفایی ( زولف و روو ) ی بەدوای یەکەوە هێنـ

واتە لە ئەنیشت یەکی پێچاون ، ئەم پێچانەشی دوو جـــار کردۆتەوە ، جاری یەکەم بە ( سونبول و گول ) ی کردۆتەوە ، ئەمەشیان کـردنەوەی رێکە چونکە ( سونبول ) کە یەکەم جار هاتووە بۆ ( زولف ) دەچێتەوە کە ئەویش یەکەم جار هاتووە ، وە ( گول ) کـە دووەم جار هاتووە بۆ ( روو ) دەچێتـەوە کە ئـەویش دووەم جار هاتووە . ، ئەمە بە گوێرەی کردنەوەی یەکەم بەڵام کاتێ کە بۆ دووەم جـــار بە ( نوورو زولەت ) دەیکاتەوە ، کردنەوەی نارێکە ، چونکە ( نوور ) کە یەکەمە بۆ ( روو ) دەچێتـەوە کە دووەمە ، ( زولـــەت ) یش کـە دووەمە بۆ ( زولف ) دەگەڕێتەوە کە یەکەمە .

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە وەفایی پێچانەکەی دوو جار کردۆتەوە ، جاری یەکەم بەرێکی و جاری دووەم بە نارێکی .

٤ — پێچان و کردنەوەی نارێك و رێك :

ئەوەش هەروا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر چەند ووشەیەك لە ئەنیشت یەکەوە بێنێ و پێکەوەیان بپێچێ و لە کاتی کردنەوەدا دوو جاریان بکاتەوە ، جاری یەکەم بە نارێکی و جاری دووەم بە رێکی .

سالم دەڵێ :

یارم لە ئەندەروون هـات دەستی رەقیب لە دەستا
غەمناك و شادومانم ، رەحـمەت عـــەزایی هێنـا

( سالم ) دوو ووشەی هێناوە ( یار ـ رەقیب ) . . لە کاتی کردنەوەدا دوو جاری کـردۆتەوەو جـــاری یـەکەم بە ( غەمناك ـ شادمان ) ی کردۆتەوە ، کە هاتنی یار مایەی شادمانی‌یە و دەرکەوتنی رەقیب جێگەی غەمناکی یە . ( غەمناك ) بۆ ( رەقیب ) و ( شادمـــان ) بۆ ( یار )

دەچێتەوە ، ئەوەش کردنەوەی نارێکە ... سالم هـــەر بەوەندە ناوەە
بەلکو جارێکی تریش پێچانەکە دەکاتەوە و ئەمجارە بە دوو ووشەی تـــ
( رەحمەت ـ عەزاب ) دەیکاتەوە ، کە ( رەحـمـەت ) ، کە سەبارەت
مانی یارو و ( عەزاب ) ، کە بە هۆی دەرکەوتنی رەقیبە . . ئەمەش
پێچانو کردنەوەی رێکە ، چونکە یەکەم شت (رەحمەت) بۆ یەکەم ش
( یار ) دەگەڕێتەوەو دووەم ( عەزاب ) بۆ دووەم ( رەقیب ) دەچێتەوە
بەم جۆرە دەردەکەێ کە ( سالم ) دوو جار پێچانەکەی کـردۆتەوە
جاری یەکەم بە نارێکی و جاری دووەم بە رێکی .

• — پێچانو کردنەوەی زۆر :

ئەوەش وا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر چەند ووشەیەك لە تەك یەکا
بێنێ و زیاتر لە دوو جـا بیانکاتەوە ، جـا کردنەوەکان بە رێکی بن یاء
بە نارێکی . ( مصباح الدیوان ) ی ئەدەب دەلێ :

تا چەند بـــە میهروستەم ئەوبیم و ئومێدە
یا بمکوژە یا رووم بدەیە خەوف و رەجا چەند

( ئەدەب ) ئەم دوو ووشەی هێناوە ( میهر ـ ستەم ) دوا بـەدوای
ئەوەوە سێ جـار کردووتیەوە ، جـــاری یەکەم بە ( بیم ـ ئومێد ) ی
کردۆتەوە ، ئەوەش کردنەوەی نارێکە . جاری دووەم بە ( بم‌کوژە ـ رووم
بدەیە ) ی کردۆتەوە ، ئەوەش هەر کردنەوەی نارێکە ، جاری سێیەمیش
بە ( خەوف ـ رەجا ) ی کردۆتەوە ، ئەوەش دیـان هـــەر کردنەوەی
نارێکە . بەم جۆرە ئەگەر کردنەوە لە دوو جار پەڕیەوە ، پێی دەگوترێ
« پێچان و کردنەوەی زۆر » .

## — دژیەك —

دژیەك بریتی یە لە هێنانی دوو ووشەی مێمل و دژیەك ، یا روو بە روو کردنی دوو واتای پێچەوانە . جا ئەم دژیەك و پێچەوانەیە داوێك بێ لە تان و پۆی هۆنراوەدا یا قەفێك بێ لە زنجیرەی پەخشاندا .

وەکو : تاریکی و رووناکی ، پیس و پاکژ ، بەرز و نزم ، رۆژ و شەو ، رەش و سپی ، گەورە و کچکە ، ئەمانە هەموویان دژو پێچەوانەی یەکترن وەکو : « لێکچواندن لە بنەرەتەوە لەسەر ئەوە هاتووە : کەم بە زۆر ، ناتەواوی بە تەواو ، نزم بە بەرز ، بچووك بە گەورە ، کورت بە درێژ ، نەزان بە زانا ، پیس بە پاکژ ، ناشیرین بە جوان ، بێ باکی بە چالاکی ، تەنگی بە شەنگی و خراپ بە چاك بکەیەنرێ . » لە سەرەتای ئەم پەرەگرافە تا کۆتایی شێ مێمل و دژیەك بێ پسانەوە بە دوای یەك هاتوون و هەموویان پێکەوە بەلگەیەکی زۆر گەش و رووناکن و راستەقینەی دژیەك دەردەخەن .

یا وەکو : ( علی کمال باپیر ) دەلێ :

تیشکی عیرفانت بەسە بۆ کەشفی هەورازو نشێو
چاوی دل بینا بوو بام چاوی دلت بینا نەبێ

ووشەی ( هەورازو - نشێو ) دژیەکن ، واتە جێگایەك هەوراز بێ لە هەمان رووداتێژو نشێو نی یە ، ئەگەر نشێو بێ رك و هەوراز نی یە . ئەوەند هەیە هەر شوێنێکە ، بۆ ئەو کەسەی سەر دەکەوێ هەورازەو بۆ ئەو کەسەی دێتە خوارەوە نشێوە . ئەومش هەیە کە هەر هەورازێك نشێوێکی بە دواوەیە ، پەندێکی کوردی هەیە دەلێ :

« هەر هەورازێك نشێوێکی هەیە . »

ئەم دوو ووشەیەی کە دژیەك دەبن جۆریان زۆرە :

١ — وا دەبێ هەر دووکیان ناوبن . وەك ئـــەو نمونەی کە لە سەر
هێنامان ، یا وەکو مامۆستا علاءالدین سجادی لـــە بارەی بنەڕەتی ئا
زەردەشتی یەوە دەڵێ :

« دوو هێز هەیە ، ئەم دووەش بەدرێژایی سال لـە جەنگ دا
دووەکەش یەکی ڕاست و یەکی درۆ ، یەکی ڕووناکی و یەکی تاریکی
یەکی پاك و یەکی پیس ، یەکی چاکە و یەکی خراپە . . . »

نووسەر لەم دەقەدا چەند ناوێکی هێنـاوە ، بە شوێن ئـەو ناوا
دژەکەیانی هێناون و بەرامبەری کردوون کە بریتین لە : ( ڕاست ـ در
( ڕووناکی ـ تاریکی ) ( پاك ـ پیس ) ( چاکە ـ خراپە ) . ئەوا
هەموویان ناون .

ئەم ووشانەی کـە لـــەم دێرە هـــۆنراوە دا دژیەك دەو
هەموویان ناون .

٢ — یا وا دەبێ هەر دووکیان پێی مانا ـ حرف المعنی ـ بن : وەکو
لە وەرگێرانی هۆنراوەیەکدا کە لە پاشکۆی گـۆڤاری ( الادب العراق
بڵاو کراوەتەوە دەڵێ :

لە هەر ساتێکا هەڵئەچێ ئەڵێ ( نا ) و ئەڵێ ( با )

( نا ـ با ) کە دوو پێی مانان هەر دووکیان دژیەکن .

٣ — یا وا دەبێ هەر دووکیان کردار بن . . جا کردارەکان ڕابوور
بن یا ڕانەبردوو یا داخوازی . وەکو ( سەلام ) دەڵێ :

هەر دوو یەك تیپن ( نوتی ) و ( وتی ) (١)

مودیر کـە بیـتی کریــــاو پێکەنی

( کریا ـ پێکەنی ) دوو ووشەی دژیەکن ، هەر دووکیان کردار
کرداری ڕابوردوون .

## — دژیەك دوو جۆرە —

پاش ئەم دابەش کردنەی سەرەوە ئێستا دێینە سەر ئەوە کە دژیەك بە جۆرێکی تر دەکرێتە دوو بەش :-

١ — دژیەکی ئیجاب : ئەوەش وا دەبێ ئەو دوو ووشەیەی کە ناویان دەبرێ و دژیەکیان لێ دەکەوێتەوە لە بارەی رەگەزەوە هیچ پەیوەندی یان پێکەوە نەبێ ، هەر یەکەیان لە رەگەزێکی سەر بەخۆ بێت . وەك ئەو نموونانەی کە لە سەرەوە هێنامان ، یا وەکو ئەوەی [ کامەران ] دەڵێ :

لە خۆبایی بوون لە سەر کەوتنا
یا نائومێدی لە ژێر کەوتنا
لە ناو دڵێکا پەروەردە نەبێ
تیا نەبێ مانای ژیان و مردن

( لە خۆبایی بوون ـ نائومێدی ) . ( سەر کەوتن ، ژێر کەوتن ) ( ژیان ـ مردن ) ئەمانە دژیەکن . . ئەو دووەی کە دژیەکیشن لە رەگەزەوە هیچ پەیوەندی‌یان پێکەوە نی‌یە ، واتە ئەسلیان جودایە و هەر یەکە لە رەگێکەوە وەرگیراوە .

٢ — دژیەکی سەلب : ئەوەش وا دەبێ کە لە پێش‌دا ووشەیەك بێنی ( ناو بێ یا کردار ) ، پاشان ووشەکە نەفی بکەی وەکو ( ئەچم ـ ناچم ) ( پیاو ـ ناپیاو ) ( یار ـ نەیار ) ( هەڵسا ـ هەڵنەسا ) . کەواتە دژیەکی سەلب بریتی‌یە لەوە دوو ووشە بێنی یەکێکیان نەفی ئەویکەیان بێت . واتە ووشەکان هەریەکن ئەوەندە هەیە یەکێکیان ئەوزاری نەفی ـ نەهێشتنی ـ

هاتۆتە سەر . کاکەی فەللاح دەڵێ :

بەڵام ئەو شتەی لە لای من روونە
لەم کەین و بەینی بوون و نە بوونە
رێی ناچاری یە ژیان و مردن
لە پاش دەرکەوتن ئەنجام وون بوونە

دژیەکی ئیجاب لە نێوان ووشەی ( ژیان ) و ( مـــردن ) بەدەکرێ . لە کـــەڵ ئەمەشدا دژیەکی سەلب لـــە نێوان ( بوون ) ( نەبوون ) دا هەیە کە دووەمیان نەفی یەکەمە .

* * *

## — دوو سەرنج —

سەرنجی یەکەم : دژیەکی سەلب سەراپا بەر رەگەز دۆزی ناتەواو دەکەوێ چونکە وا دەبێ یەکێ لە پیتەکانی نەفی ـ نەهێشتن ـ ( نە ، نا ، مە ، بێ . . . ) بخرێتە سەر ووشە نەژادی یەکە بۆ ئەوەی مانای پێچەوانە ببەخشێ ، دیارە ئەوحەلەش ووشە نەفییەکە ئەو دوو پیتە زیـاد کراوەی لە ووشە نەژادی یەکە پتر دەبێ و بەمەوەش رەگەز دۆزی زیـاد دروست دەبێ ، کە یەکێ لە ووشەکان دوو پیت لەوی تر زیاترە . پیرەمێرد دەڵێ :

هەندێ بە جیرەی دڵن بێ هۆش ئەبێ
هەندێ بە بۆنی خـۆش نەخـۆش ئەبێ

( خۆش ـ نەخۆش ) کە دژیەکی سەلبیان لێ کـەوتۆتەوە ، بەر رەگەز دۆزی زیاد دەکەون ، چونکە مانایان جودایە و رواڵەتیان بە یەك دەچێ ئەوەندە هەیە ووشەی دووەم دوو پیتی سەرەتـای لە ووشەی یەکەم پترە ، بۆیە رەگەز دۆزی یەکەی نێوانیان رەگـەز دۆزی زیـادە . . یا وا دەبێ هیچ پیت بۆ ووشە نەژادی یەکە زیاد نەکرێ بەڵکو پیتی یەکەم یا یەکەم و دووەمی بگۆردرێ بۆ نەفی کردنی مانای ووشەکە وەکو ( ئەچم ـ نەچم ) ، کە پیتی یەکەمیان جودایەو بەس ، بۆیە لە پاڵ بوونیان بە دژیەکی سەلب رەگەز دۆزی جوداش باڵیان بە سـەردا دەکێشێ . بـــە کـورتی هەموو دژیەکێکی سەلب رەگەز دۆزی ناتەواوە بەڵام مەرج نییە هـەموو رەگەز دۆزێکی ناتەواو دژیەکی سەلب بێ . سەرنجی دووەم : زۆر جار وا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر دوو ووشە دێنێ لـــە رواڵـەت دا یەك شتن بـەڵام کوزارەیان دژو پێچەوانەیە ، وانە لە سەرەوە رەگەز دۆزی تـەواو دەیـان

کەیێنێتە یەکترو لــە ژێرەوەش دژیەکی ئیجاب پێکەوەیان دەبەستێتەوە .
وەکو :

ملی رێ بگرە و بــڕۆ بۆ بەرزی
یا سەرداری یە یا ســەرداری یە

( سەردار ) دوو جــــار هاتووە ، یەکێکیان مانای بوونە رابەرو پێشەوا دەدات و ئەویتریان مانای چوونە سەرداری تەنارەو خنکان دەدات ، لێرەدا کە ( سەردار ) دوو جار هاتووەو هەر جـــارەی واتایەك دەدات رەگەز دۆزی تەواو دروست دەبێ ، لە هەمان کاتیشدا گوزارەی ( سەردار ) ی یەکەم دژو پێچەوانەی ( سەردار ) ی دووەمــە کەواتـــە دژیەکیان لێ کەوتۆتەوە . . ئەم دوو وشەیە لــە لایەکەوە رەگەز دۆزی تەواون و لە لایەکی تریش دژیەکی ئیجابن .

＊ ＊ ＊

## — بەرامبەری —

بەرامبەری وەکو دژیەك وایە ، یا خود خۆی دژیەکە ، ئەوەندە هەیە جۆرە دژیەکێکی تایبەتی یە ، لە دژیەك تەنیا یەك ووشە دێت و دژەکەی بە شوێنەوە دەهێنرێ بەڵام لە بەرامبەری وانی یە ، بەلکو لە پێشاندا چەند ووشەیەك دێنێ ئینجا بەرێکی یەکە یەکە دژەکانیان دێنێت ، بێ گومان ئەمەشیان جۆرە پێچان و کردنەوەیەکە وەك لەمەولا باسی دەکەین ، چونکە نووسەر یا هۆنەر لە پێشا چەند ووشەیەك پێکەوە دێنێ ئنجا دەیانکاتەوە کە دەشیانکاتەوە بە دژەکانیان دەیانکاتەوە .

نالی دەڵێ :

طیبە کە یەعنی رۆژ و شەوی طیبی عالەمە
رۆژی کە ووشکە شەو تەڕە کافوری عەنبەرە

لە نیوەی یەکەم ( رۆژ ـ شەو ) دژیەکن ، چونکە یەك ووشە هاتووەو راستەو خۆ دژەکەی بۆ هێنراوە . بەڵام لە نیوەی دووەم بەرامبەری هەیە چونکە یەکەم جار دوو ووشەی بە دوای یەکەوە هێناوە ( رۆژ ـ ووشك ) ئنجا بە شوێن ئەوانەوە دژی هەر یەکەیانی بەڕیز هێناوە ( شەو ـ تەڕ ) و بە رێكو پێکی بەرامبەری کردوون . کە ( شەو ) دژی ( رۆژ ) ە و ( تەڕ ) دژی ( ووشك ) ە .

ئەمە بریتی بوو لە بەرامبەر کردنی دوو شت بە دژەکانیان واش دەبێ سێ شت بەرامبەر سێ شت بکرێ وەکو : « رۆژ بە هوشیاری لە

دەرەوە ، شەو بە نووستن لە ژوورەوە ، بە سەر دەبەین . ە لە پێشا سێ
وشە هاتوون ( رۆژ ـ هوشیاری ـ دەرەوە ) ئنجا دژەکانیان یەك لە دوای
یەك هاتووە ( شەو ـ نووستن ـ ژوورەوە ) بە کورتی ، بەرامبەری برێتی
یە لە هێنانی چەند وشەیەك بە دوای یەکەوە ئنجا هێنانی دژەکانیان کە
چی لە دژیەك تەنیا یەك وشە دێنێ و راستە و خۆ دژەکەی بە دواو
دەکوترێ ، بۆیە دەتوانین بڵێین بەرامبەری جۆرێکی تایبەتی یە لە دژیەك .



## — سەرنجێك —

لە پێچان و کردنەوەدا گوتمان نووسەر یا هۆنەر لە پێشەوە چەند ووشەیەك دێنێ و لە تەنیشت یەکیان ریز دەکا ، ئنجا لە کاتی کردنەوەدا چەند ووشەیەکی تر دێنێ کە پەیوەندی یان بە ووشەکانی پێشەوە هەبێ ، ئەو پەیوەندیەش وا دەبێ پەیوەندی لێکچواندن بێ ، یا هۆو سەبارەت بێ ، یا دژو پێچەوانە بێ یا . . .

لە ( بەرامبەری ) ش گوتمان ، ئەوەیە کە لە پێش دا چەند ووشەیەك لە دوای یەکەوە بێنێ ئنجا بەریز دژەکانیان یەك لە دوای یەك بۆ بێنێ ، ئەگەر ووردی لەم دوو ئەیە بکەین ئەوەمان بە تەواوی بۆ دەر دەکەوێ کە ( بەرامبەری ) جۆرێکە لە پێچان و کردنەوەو بگرە پێچانو کردنەوەی رێکە ، چونکە لە ( بەرامبەری ) دا مەرجە دژەکان بەریزی یەك لە دوای یەك بێن . . بۆیە دەتوانین بڵێین کە هەموو ( بەرامبەری ) یەك پێچان و کردنەوەی رێکە ، بەلام مەرج نییە هەموو پێچان و کردنەوەیەکی رێك ( بەرامبەری ) بێت . .



# — جێ گـۆڕین —

جێ گۆڕین وا دەبێ کە لە پێش دا دوو وشە یـا دوو دەستە یا دوو رستە بێنی ، ئنجا بە دوای ئەوەوە هەر دوو وشە یا دەستەو رستە دووپات بکەیتەوە بەو مەرجەی جێ‌گۆڕیان بکەیت ، ئەوەی پێ تبوو پاشی بخەی ، ئەوەی لە دواوە بوو لە بەرایی‌یەوە بیهێنی .

وەکو : « ئایا خۆشەویست جوانە ، یا جوان خۆشەویستە . »

یەکەم جار دەڵێ [ خۆشەویست جوانە ] واتە [ خۆشەویست پێش [ جوان ] هێناوە . بەڵام کە جاری دووەم دوو وشـەکەی هێ پاش و پێشی کردوون دەڵێ [ جوان خۆشەویستە ] ، واتە وشەی [ جو ی پێش وشەی [ خۆشەویست ] خستووە .

مامۆستا علاءالدین سجادی دەڵێ :

« شێخی کە پیری بە پیری بەرزی پەری بووبێ هەر ئەو بووە . که شێخی لە پیری چاوی شۆخی کـەری بوو بێ هەر ئەو بووە . . »

لە هەڵویستی یەکەم وشەی ( شێخی ) پێش وشەی ( پیری ) هێنـ بەڵام لە هەڵویستی دووەم جێگەی ئەم دوو وشەیەی ئاڵ وگۆڕ کردوو وشەی ( پیری ) پێش وشەی ( شێخی ) هێناوە .

نالی دەڵێ :

ئەو رووی لە کەعبەو کەعبە بە رووی ئەو مشرفە
یـــا جەبینی قیبلە و محراب و مینبـــــەرە

یەکەم جار ( روو ) پێش ( کەعبە ) هاتووە ، دووەم جـــار ( کەعبە پێش ( روو ) کەوتووە .

احمدی خانی دەڵێ :

ئەو جەوهەری تاج و تاجی جەوهەر
ئەو ئەفسەری زیب و زیبی ئەفسەر

لە نیوەی یەکەم شوێنی (جەوهەر - تاج) پاش و پێش کراوە و لە نیوەی دووەمیش جێگەی ( ئەفسەر - زیب ) گۆڕدراوە .

جێ گۆڕین جۆری زۆرە :-

١ — وا دەبێ ئەو دوو وشەیەی کە جێیان دەگۆڕێ هەر دووکیان دەبن .

نالی دەڵێ :

گەرچی ظاهر سەر لە تەن مەهجورە ئەمما تەن لە سەر
کونبەدی دەواری دەوری عەرشی غەوثی أعظمە

( تەن - سەر ) کە جێگایان گۆڕاوە ، هەر دووکیان ناون .

٢ — یا وا دەبێ دوو ( راناو ) جێیان بگۆڕدرێ .

سەلام دەڵێ :

نەتۆ بەبێ من ، نەمن بەبێ تۆ ئەژین لە ژیان
ئاڵاین بە یەك دا وەکو تان و پۆ یەك لاشە یەك گیان

یەکەم جار ( تۆ ) ی پێش ( من ) خستوە ، کە دووپاتی کردوونەتەوە ( من ) ی پاش ( تۆ ) خستوە ئەوانەش ( تۆ - من ) هەر دووکیان راناون و راناوی جوێن .

٣ — یا وا دەبێ ئەم دوو وشەیەی جێگایان دەگۆڕدرێ یەکێکیان ( ناو ) و ئەوەی تریان ( راناو ) بێت .

شێرکۆ بێکەس دەڵێ :

ئەی شارەکەی تۆی حوزیران
تۆ سەیرانی یا سەیران تـۆی.

یەکەم جار ( تۆ ) ی پێش ( سەیران ) هێناوە ، ئنجا ( سـەیرانی پێش ( تۆ ) هێناوە . ئەوانەش یەکێکیان ـ تۆ ـ زاناوە و ئەوەی تر ـ سەیران ـ ناوە .



## — پۆشین — (١)

پۆشین کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ ـ التـــوریە ـ و پیشەیەکی ئەشەنگە لە پیشە ڕەوانبێژی‌یەکان مانای ئەوەیە کە هۆنەر یـــا نووسەر ووشەیەك بێنێت ، ئەو ووشەیە دوو واتا بگەیەنێت ، یـــەکی دوورو یەکی نزیك . . کە دەڵێین واتایەکی دوور ، مەبەست ئەوەیە کە پیاو درەنگ بۆی دەچێ و ئەختێ لێکدانەوەی پێ دەوێ . . بەڵام کە دەڵێین مانایەکی نزیك مەبەست ئەوەیە کە گوێگر یا خوێنەر هەر زوو بۆی دەچێ و وەری دەگرێ جا مەرجە لە پۆشین کەهۆنەر یا نووسەر مەبەستی بەم ووشە جووت واتایە ، واتا دوورەکە بێت کە دەبێ بەنیشانەیەکی پـــۆشراو هێمای بۆ بکات . بێ گومان ئەم واتا دوورەش وا نەبێ لە پیاوی زرنگ و هوشیار وون‌و شاراوە بێت بەڵکو هەر ئەوەندەیە کە سەر لە پیاوی کەم بین دەشێوێنێ و ئەزاکە-تێکی تەڕیش پەیدا دەکا . بۆ نموونە شێخ سەلام دەڵێ :

( ژیـان ) نـازانم تاوانت چی‌یە ؟
بۆچ لە لای ئێمە ڕەغبـەتت نی‌یە ؟

( ژیان )ووشەیەکە دوو مانا هەڵدەگرێ ، یەکی نزیك کە پیـاو زوو بۆی دەچێ ئەویش ڕابواردن‌و ژیانی گیان لەبەرە ، وە مانایەکی دوور کە پیـاو پاش زانینی هۆی نووسینی ئەم پارچە هەڵبەستە بـۆی دەردەکەوێ ئـەویش ئەوەیە کە ( ژیان ) ناوی ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بوو پیرەمێردی زیندوو لە سلێمانی دەری دەکرد ، جا لێرەدا شێخ سەلام وا نەبێ مەبەستی واتا نزیکە کە بێ کە ژیـانی ڕۆژانەیە بەڵکو مەبەستی مانـا دوورەکەیە کە نـــاوی ڕۆژنامە هەفتانەکەی پیرەمێردە .

---

( ١ ) لـــە ژمارەی تایبەتی ساڵی دووەمی ڕۆژنامەی هاوکاری پوختەی ئـەم باسە بڵاو کراوەتەوە .

## — جۆرەکانی پۆشین —

پۆشین جۆری زۆرە لەمانە هەندێکیان بۆ نموونە باس دەکەین :

١ - **پۆشینی رووت** : پۆشینی رووت ئەوەیە کە ئەو وشەیەی پۆشینی لێ دەکەوێتەوە رووت و رووت بێ و تەنها هاتبێ ، واتە پەیوەندی بە هیچ وشە یا گوزارەیەکی تری رستەکەوە نەبێ ، واتـە نابێ وشەکە شتێکی وای لە گەڵدا باس کرابێ کە پەیوەندی بـە مانـا دوورەکەی وشەکە هەبێت یا پەیوەندی بەمانا نزیکەکەوە هەبێ .

پیرەمێرد دەڵێ :

تۆخەی گەلاوێـــژ وا دەرکەوتیەوە
وەك چرای بەختی کورد سەرکەوتیەوە

لێرەدا وشەی ( گەلاوێژ ) دوو مانا دەدات ، یەکی نزیك کە . زوو دەکەوێتە زەینەوە ، ئەویش ئەستێرەیەکی جریوەدارە پـــاش چ هاوین دەر دەکەوێ . وە پیرەمێرد مەبەستی ئەم ئەستێرەیە نییە . . وەها مانایەکی دووریشی هەیە کە ناوی گۆڤارێکی کوردی بووە ، گۆڤارە مانگانە - گەلاوێژ - لە شـــاری بەغدا دەر دەچوو و نووسە رۆشنبیرانی کورد دەیان بـــرد بـەرێوە ، پیرەمێـرد مەبەستی بە وا - گەلاوێژ - ئەم مانا دوورەیە . وشەی - گەلاوێژ - کە پۆشینی لێ تۆتەوە هیچ وشەیەکی وای لە گەڵدا نەهاتووە کەپەیوەندی بە ئەست گەشی بەرەبەیانی پاش چلەی هاوینەوە هەبێت ، یا پەیوەندی بە گـۆ تێکۆشەری گەلاوێژەوە هەبێت . بەڵکو وشەکە رووت و بە تـــاق هاتووە . . واتە لە هۆنراوەکەدا نەهێماو ئیشارەت بۆ مانا دوورەکە

نه بۆ مانا نزیکەکەش ... ئەم جـــۆرە پۆشینەش پۆشینی ( رووت ) ی پێ دەڵێن .

٢ — **پۆشینی پالاو** : بریتی‌یە لەوەی کە ئەو وشەیەی پۆشینی ان دەکەوێتەوە لە رستەکەدا شتێکی وای لـە گەل دا هـــاتبێ کە ئەو شتە پەیوەندی بە مانا نزیکەکەوە هەبێت . ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەی تـا زیاتر بیروهۆشی گوێگر بۆ لای مانا نزیکە نا مەبەستەکە بچێت و زەین و هۆشی لە مانا دوورە مەبەستەکە دوور بکەویتەوە . پیرە مێرد دەڵێ :

( ابراهیم ) لە نـاو ( نـار ) ا ســووتاوە
( سجـادە ) ی تەقـوا بێ رایەڵ مـــاوە

ئەم بەیتەی پیرەمێرد دێرێکە لە هۆنراوەیەکی دوور و درێژ کە لە ٢٥ ی ئابی ١٩٤٩ دایناوە ، ئەمەشیان پاش داخـستنی گۆڤاری گەلاوێژ کە ( ابراهیم احمد ) خاوەنی امتیاز و مامۆستا ( علاءالدین سجادی ) سـەر نووسەری بوو . لەم هۆنراوەیەدا وشەی ( ابراهیم ) ، دوو مانای هەیە ، یا دوو ( ابراهیم ) هەن ، یەکی نزیك کە ( ابراهیم ) پێغەمبەرە و مەبەست ئەو نی‌یە . هەر لە بەر ئەوەش پیاو زوو بیری بۆ لای ئیبراهیم پێغەمبەر دەچێ چونکە پیرەمێرد لە هۆنراوەکەدا وشەیەکی هێناوە پەیوەندی بە ( ابراهیم ) پێغەمبەرەوە هەیـە ئەمەشیان کە دەڵێ : ( لە نـــاو نارا ســووتاوە ) . ئەمەیـــان چیرۆك و داستانی ( ابراهیم ) پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەڵێن کاورەکان مەنجەنیقێکیان کردەوە و حەزرەتی ( ابراهیم ) یان تێ فڕێدا بەڵام نەسووتاوە چونکە خوا فەرمانی بە ئاگرەکە کرد « یا نار کونی برداً وسلاماً علی ابراهیم ) » . . ئەمە مانـــای نزیکی وشەی ( ابراهیم ) مانا دوورەکەش مەبەست ( ابراهیم احمد ) ، کە خاوەنی

ئیمتیازی گۆڤاری گەلاوێژ بوو . بێ‌گومان ئاشکرا پیرەمێرد ئەم مانا دوورە مەبەستە . لەم هۆنراوەیەدا دەبینین کە ووشەی ( ابراهیم ) کە پۆشینی کەوتۆتەوە ووشەیەکی تری لە تەك هاتووە ، ووشەی ( نار ) ی لە گ هاتووە کە پەیوەندی بە مانا نزیکەکەوە هەیە و نزیکتری دەکاتەوە . هە وەها ووشەی ( سجادة ) دوو مانای هەیە یەکی نزیك کە بەرمالی نوێژ ئەتواو خواپەرستی‌یە ، پیرەمێردیش ووشەی ( ئەتوا ) ی لە تەکەوە هێن کە ئەمەشیان زیاتر پیاو بۆ لای بەرمال و خــوا پەرستی دەبا ، کە پیرەمێرد مەبەستی ئـەوە نی‌یە ، مەبەستی مانایەکی ترە کە ئەختی دوو ئەویش بریتی‌یە لە مامۆستا ( علاءالدین سجادی ) کە بــە ( سجادی ناوبانگی دەرکردووەو سەر نووسەری گۆڤاری گەلاوێژ بووە . . بەم جۆ ئەگەر ووشەی پۆشین ووشەیەکی وای لە گەڵدا هـــات کە پەیوەندی مانا نزیکەکەوە بێت ئەوا دەبێتە ـ پۆشینی پالآو ـ .

مەولەوی دەڵێ :

ئەیاز هەمراز ناڵە و ئـاخ و دوود
هەرزش هەن وەخاك ئاسانەی مەحموود

مەحموود دوو مانا دەدات . یـا دوو مەحموود هـەن یەکی نـزیك کە دەکەوێتە بـەر بیرو خەیالی پیـاو ئەویش « سلطان محمودی گو سەبەکتەکینی غەزنەوی‌یە » و مەولـــەوی مەبەستی ئەمە نی‌یە . . لــ هۆنراوەیەدا ووشەی ( ئەیاز ) هاتووە کە پیاوی سلطان محمود بەکت واتە ئەو ئەیازە پەیوەندی بـــە مانـــای نزیکی محمودەوە هەیە کە ئ سلطانە . هەر وەها ئەشێ ئەم محمودە مانایەکی تری هەبێ یا محمودێکی هەبێت . . کە محمود پاشای جانە . . بێ گومان مەولەوی مەبەستی ئ

ئەم محمودە بووەو رووی قسەی هەر لەو کردووە . وەکاتێ کە ووشەی ( ئەیاز ) ی هێناوە مەبەستی خۆیەتی کە خۆی بە خزمەتکاری محمود پاشای جاف دانـاوە . .

* * *

۳ – **پۆشینی ئاشکرا :** ئەوەیە کە لە گەڵ ئەو ووشەیەی پۆشینی لێ دەکەوێتەوە ووشەیەك یـا شتێکی تـر بکوترێ کە پەیوەندی بە ملنـا دوورەکەوە بێت و تۆزێ دەری بخا . جا چونکە بەم ووشە یا ئەم شتـە باس کراوە.مانا دوورەکـە نـەختێ ئاشکرا دەبێ بۆیە پێی دەکوترێ پۆشینی ئاشکرا ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا ( علاءالدین سجـادی ) لـە ( ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ) دا ل ۱۰٤ بە کورتی چەند دێرێکی لە سەر ئەم پیشە رەوانبێژی‌یە نووسیوە و ( توریە ) ی بە کوردی ناو ناوە ( توانج پۆشی ) . . نـازانم مامۆستا سجادی بـە چ مەبەستێکەوە ئەم ناوەی بۆ داناوە ؟ خۆ مەرج نی‌یە ئـەو شتەی دەپۆشرێ هەر توانج بێ تا ناوی لێ بنرێ ( توانج پۆشی ) . زۆر جار وادەبێ کە هۆنەر یا نووسەر ووشەیەکی وا دێنێ و مانایەکی وا دەپۆشێ کـە هیچ توانج و پلار نی‌یە وەکو ووشەی ( ژیان ) کە لە سەرەوە باسمان کردو گوتمان مانا دوورو پۆشراوەکە ناوی رۆژنامەیێکی هەفتانـە بوو پیرەمێرد دەری دەکرد یا وەکو ووشەی کەلاوێژ کە مانا دوورو پۆشراوەکەی نـاوی گۆڤارێکی کوردی‌یە . یا وەکو ووشەکانی ( ابراهیم ـ سجادە ) کە ناون .

هەر وەها بە گوێرەی نموونەکانی تریش کە خستمانە بەر چاو . جا گەرە
بڵێم ئایا بە هیچ چەشنێ ئەم ناوانەی وەکو : « ژیان - کەلاوێژ
ابراهیم - سجادە - محمود - » کە پۆشینیان لێ کەوتۆتەوە ،
بە هیچ کلوجێك مانا دوورەکەیان توانج و پلارە ؟ ! بێ گومان نە
کەواتە چۆن و بە چ جۆرێ بەوانە بڵێین توانج پۆشی ؟ !
خۆ راستە زۆر جاوا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر توانجێك دەپۆ
ئنجا دەیهاوێتە بەرامبەرەکەی بەڵام خۆ مەرج نی یە هەموو پۆشراوێك ،
توانج بێ . کەواتە بە باوەری من ( توریە - پۆشین ) بریتی یە لەوەی
هۆنەر یا نووسەر ووشەیەك بێنێ ، ئەو ووشەیە دوو مانا هەڵبگرێت یە
نزیك و یەکی دوور و خۆی مانا دوورەکەی مەبەست بێ و ئەم مانا دو
لە ژێر مانا نزیکەکەوە دابپۆشێ و بیشارێتەوە جا مانا دوورەکە هەر
هەبێت : توانج بێ ، پیا هەڵدان بێ ، ناو بێ ، باس کردن بێ ، کاڵ
و کەپ بێ . » هەر لە بەر ئەمەشە وای بە پەسند دەزانم کە نا
( پۆشین ) بێ نەك ( توانج پۆشی ) ، چونکە وەکو دەرکەوت ( پۆشی
نەختێ فراوانترە و هەموو شتێ دەگرێتەوە بەڵام ( توانج پۆشی ) تە
توانج دەگرێتەوەو بەس . جا نازانم مامۆستا علاءالدین سجادی چی دەڵێ

## — جوانی بایس —

یەکێکی تر لە هونەرە جوانکاریەکان جوانی بایسە ، جوانی بایس ئەوەیە کە داوای سەبارەت و بایسێکی جوان و بەجێ بکرێ بۆ خاسەویژی شتێك کە ئەو سەبارەتە لە راستی دا سابارەتی خاسەویژی شتەکە نەبێ . . ئەو داوا کردنەش کە دەکرێ دەبێ بە شێوەیەکی جوان و لێوەشاوە بێت بۆ ئەوەی شەوق و جوانی و رنك و رەوانی یەکی تر بدا بە هۆنراوەکە . .

( گۆران ) دەڵێ :

مانگی بەجێ‌ملو لە سەفەری شەو
زەردە لە ترسی قاسپە قاسپی کەو

زەرد بوونی مانگ لە کۆتایی شەو دا خاسەویژێکە هەیە . . بێ گومان ئەم زەرد بوونەی مانگ لە راستی دا سەبارەتی تایبەتی خۆی هەیە کە دەرکەوتنی رووناکی و شکانی لەشکری شەوە ، بەڵام ( گۆران ) چاو لەو سەبارەتە دەپۆشێ ، دێنێ لە خۆیەوە سەبارەتێکی تر بۆ ئەو خاسەوێژە دەدۆزێتەوە کە قاسپە قاسپی کەوە . . دەڵێ ملنگ گوێی لە قاسپە قاسپی کەوان بووە بۆیە وا رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە . . بەم جۆرە سەبارەت دەست کرد و خۆکردی یە کە دەبێ بە سەبارەتێکی بناغەیی و سەبارەت رەسەن و راستە قینەش کە دەرکەوتنی رووناکی رۆژە دەبێ بە سەبارەتی دووەمین . . ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەی بەو سەبارەت هێنانەوەیە هۆنراوەکە شەوق و جوانی یەك پەیدا بکات و بچێتە دڵەوە .

( جوانی بایس ) لە سەر دوو جۆر دەڕوا :

یەکەم : ئەوەیە کە خاسەویژەکەی هەیەو گومانی تێدا نی‌یە ، مەبە
هەر ئەوەند کە بۆ جوانی‌و نەزاکەتی سەبارەتی راستە قینەی خاسەویژ
پشت گوێ بخرێ و سەبارەتێکی تـــری بۆ دروست بکرێ . .
ئەوەشیان دوو جۆرە :
أ ـ ئەوەشیان خاسەویژەکەی هەیە و گومانی تێـدا نی‌یە مەبە
ئەوەیە باسی سەبارەتەکەی بکرێ و سەبارەتی راستە قینەیش بەرەوش
بە نەریت نابێ بە سەبارەت یاخود ناویستری بکرێ بە سەبارەت ، ،
چەند لە راستی دا لە سەبارەت خالی نی‌یە . .
( نـالی ) دەڵێ :

هێند مونتەزری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس کە لە سەر یەك قەدەم و دیدە چەقی بوو

نێرگس خاسەویژێکی ئاشکرای هەیە کە چاو سپێتی‌یە ، لە رواڵە
سەبارەتی ئەم سپێتی‌یە دەرناکەوێ ، جا هۆنەر هێناویە سەبارەتی ئەو
سپی بوونەی بەوە لێك داوەتەوە کە زۆر چاوەڕێی یاری کـردووە
بەر ئەم چاوەڕێ کردنە چـاوی سپی بووە . . کەچی لـە راستیشدا
خاسەویژە ـ کە چاو سپێتی‌یە ـ سەبارەتی راستە قینەی خـۆی هەیە
چەند شتێکە لە خودی گوڵەکەوە خۆی و سپێتی‌یە کە دروست دەکەر
بەڵام ئەو سەبارەتە نامێنرێتە بەر چاو بەڵکو چاوەڕێ کردنەکە دەکر
سەبارەت . . جا ئێمە کە تەماشای بـایس و سەبارەتی راستەقینە دەک
ـ کە هەندێ شتەو لە خودی گوڵەکە دایە ـ بە رەوشتەو بە نەریت نا
بە سەبارەت یا خود ناویستێ بکرێ بە سابارەت . .

ب — ئەوەیە کە خاسەوێژەکەی هەیە و هیچ گومانی تێدا نی یە ،
وە ئەو خاسەوێژە سەبارەتێکی دیارو ئاشکرای هەیە کە هەموو کەس
دەیزانێ بەلاّم مەبەست ئەوەیە هەر بۆ جوانی ئەم سەبارەتە راستەقینەیە
بە لاوە بنرێ و شتێکی تر بکرێ بە سەبارەت و بایسی ئەم خاسەوێژە ..

( گۆران ) دەڵێ :

لە لێوار حەوزا گوڵاڵە و بەیبوون
ساوان ئەلەرزن لە تاو نقوم بوون

لێرەدا خاسەوێژێك هەیە کە لەرزینی گوڵاڵەو بەیبوونە ، ئەوەش
خاسەوێژێکە هەیەو هیچ گومانی تێدا نی یە ، سەبارەتی ئەم جوولانەوەو
لەرزینەش لە راستیدا ئەوەیە کە بە دەم کزەباوە دەلەرێنەوە ، ئەم
بایس و سەبارەتە راستەقینەش لای هەموو کەسێ ئاشکراو دیارەو کەس
نی یە نەیزانێ و بارِی کەلێ زۆرە ، کەچی گۆران ناچێ راستەوراست هۆی
ئەم لەرزینە بۆ سەبارەتە راستەقینەکە بیاتەوە کە هاتێ کزە بایە ، بەڵکو
ئەم سەبارەتە پشت گوێ دەخات و دەچێ دەگەرێ سەبارەتێکی تری بۆ
دەدۆزیتەوە ، وای لێك دەداتەوە کە گوایە هۆی لەرزینی ئەو گوڵاڵەو
بەیبوونە ئەوەیە کە پاش باران بارین بینیویانە ئاوی حەوزوکە زیادی
کردووە و هەڵساوە و نزیك بووە ئەوانیش دابگرێ و نقومیان بکات ،
ئەوانیش ـ گوڵاڵەو بەیبوون ـ کە ترسی نقووم بوونەکەیان کەیشتووتێ لە
هەژمەتان کەوتوونەتە لەرزو جوولانەوە ... بەراستی بایسێکی جوان و
هونەرمەندانەی بۆ لەرزینەکە دروست کردووە .. کە چووە گیانی بە
گوڵاڵەو بەیبوونەکە بەخشیوە و وای لێ کردوون کە وەکو زیندوو و
زیندووی بە ئەقلیش هەست بە نقووم بوون بکەن و ئەم هەستە ترسیان

له دل دا پەیدا بکات و ترسەکەش بیانخانە لەرزینەوە بـــەم جۆرە سەبارەتە دروست کراوە « کە هۆی لەرزینەکە بۆ تـــرسی نقووم ؛ دەباتەوە » دەبێ بە سەبارەتی سەرەکیو پەل بەسەر هۆنراوەکەدا دەکێ هەستی خوێنەر یا گوێگر بە تەواوی بۆ لای خۆی رادەکێشێ و سەبار راستەقینەش لە گەڵ ئەوەدا کە زۆر ئاشکراو بەر چاوە و هەموو دەیزانێ و هەستی پێ دەکا کە ( هـاتنی بایە ) لە پەنـا تین و تەوو دووەمین ، یا هەر بیری لێ ناکرێتەوە .

**دووەم :** ئەوەیە کە خاسەوێژەکە نەبێ و بویستێ بوونی بـۆ درو بکرێ ، ئەمەشیان وانە خاسەوێژەکە یا دەشێو دەگونجێ یا هەر ناکونێ.

ئەوەش دوو جۆرە :

أ — ئەم بەشەیان ئەوەیە کە خاسەوێژەکە نەبێ ، یا خود هەبێو کو لێ بکرێ . جا بویستێ بوونێك بۆ ئەم خاسەوێژە دروست بکرێ و تەواوی بچەسپێنرێ . . ئەم بە خاسەوێژ کردنەش شتێکی گونجاو و شاوەییت . .

( مەجدی ) دەڵێ :

مینەتی ئیحسانی ( واشی ) م وا لە سەر ئەی ئەهلی شەرق
ترسی ئـــەو بوو رستکار بوو چاوەکانی من لـــە غەرق .

( واشی ) ئەو کەسەیە کە قسە لە نێوان دۆست و برادەران دێنێ و بۆ ئەوەی لێکیان بتۆرێنێ و دڵیان لە یەك بڕەنجێنێ ، ئەم جۆرە کە پێێ دەگوترێ ( قسـە چن ) چونکە بۆ مەبەستی پیـسی خـۆی بـە خۆی قسـە هەڵدەبەستێ . . ( قسـە چن ) ئومێدی چاکەی قەت لێ نا ئەم خاسەوێژە « کە ئومێد کردنی چاکەیە لە قسـە چن . » لە ( قسـە

دا نی‌یە ، ئەگەر هەش بێ گومانێکی زۆری لێ دەکرێ . . جا هۆنەر دەیەوێ ئەم خاسەویژە کە نی‌یە یا هەیە و گومان لە بوونەکەی دەکرێ بە تەواوی بچەسپێنێ و بیبانە دلی خەلکەوە کە دەلێ :

ئەی خەلکی رۆژ هەلات ! چاك بزانن کە من مننەتی قەچنم بە سەرەوەیە چونکە لە ترسی ئەوەی نەوەك قەچن من لە جۆشی گریان‌دا بەدی بکات و بچێ ئەم گریانەم بە جۆرێکی تر بگێرێتەوە ، لەم ترسەوە من گریانەکەم قووت داوە و نەگریاوم ، کە نەش گریـاوم چاوەکانم بوو مایەوە چونکە ئەگەر بگریابوام ئەوەندە دەگریام تا ئاوی چاوم دادەهات و کوێر دەبووم . . کەواتە مننەتباری قەچنم کە لە ترسی ئەو نەگریـام و ئەو بووە هۆی ئەوە کە چاوەکانم بە قازانج بۆ بمێنێتەوە ، دیـارە لێرە ( قەچن ) چـاکەی هەبوو . . بۆیە ( مەجدی ) ئەوە دەسەلمێنێ کە ( قەچن ) ئومێدی چاکەی لێ دەکرێ ، کە پێش سەلماندن و بایس هێنانەوەی ئەو ئەم ئومێد پێ بوونە جێگەی گومانێکی زۆر بوو .

ب — ئەوەیە کە خاسەویژکە نەبێ و گومانی لێ بکرێ ، وە پێویستی بوونێکی بۆ دروست بکرێ و بکرێ بە خاسەویژ . . لە گەل ئەوەش‌دا کە ئەم دروست کردنی خاسەویژەیە ناگونجێ بەلام هۆنەر هەر دەیهێنێ و بە خاسەویژی دادەنێ . بێخود دەلێ :

ئەگەر جەوزا نیـازی بەندەگی شۆخی لـە سەر نەبوای
نەدەبینرا کەمەر بەستە لە سەر ئەو ئەوجی ئەفلاکە

( جەوزا ) چەند ئەستێرەیەکن لە شێوەی جووتێ منالی رووت دا بە هەر چوار دەوری ئەم جەوزایە کۆمەلە ئەستێرەیەك ئاخلەیان بەستووە و بووین بە پشتێن بۆی کە پێیان دەلێن « نطاق الجـوزاء » . . جا بێخود دەلێ :

ئەگەر ( جەوزا ) مەخسەدی ئەوە نەبوایە کە بیێ بە بەندەو حەلقە لـ
کوێ‌و خزمەتکاری یار بەم جۆرە لەو سەرەوە پشتێنی بەندایەتی نەدەبەست
پشت .

لێرەدا خاسەوێژی « خزمەت کردنی یار لە لایەن جەوزاوە »
شتێکە نە هەیەو نە دەش کونجێ . جا چۆن یێخود دەیەوێ بوونەکی ؛
پێك بێنێ ، ئاواش دەیەوێ کونجانی بسەلمێنێ ئنجا کونجانی بــەوە لێك
دەداتەوە کە لە سەرەوە کەمەر بەستەو دەست لە سەر دەست بۆ خزمەتی
یـار راوەستاوە . . ئەمە ناکونجێ جەوزا بۆ خاتری خزمەتی یار چووبێ
لەوێ کەمەری بەستا بێ بەڵام لە گەڵ ئـەوەش دا هـۆنەر هــەر دەیدا
بە خاسەوێژ .

# — بادانەوە —

بادانەوەش پێشەیێکی تەشەنکی ترە لە پیشە جوانکاری یەکانو برچی یە لەوەی کە لە پێشدا قسەیەك بکەیتو بە دوای قسە کردنە کە راستەو خۆ نکوولو لالوتی لە قسەکە بکەیت شتەکە بە جۆرێکی تر هەڵبگێڕیتەوەو لێك بدرێتەوە . . لە فۆلکلوری کوردیدا یە دەڵێ :

کاغەز ئەنووسم بە خوێنی دڵم     ئەیدەم بە شەماڵ بیبا بۆ گوڵم
نایدەم بە شە ال پێچ و پەنایە     بە خۆم بۆی ئەبەم داخم لە دڵایە

لێرەدا لە پێشەوە بڕیارێك دەداو دەڵێ کاغەز بە خوێنی دڵ بۆ یارەکەم دەنووسمو کە نووسیشم دەیدەمە شەماڵی نەرمو ناسك تا هەڵی بگرێ و بیگەیەنێتە لای یارە نازدارەکەم . . پاش ئەوەی ئەم بڕیارە دەبینێتەوە ، ئەختێ بیر دەکاتەوە و لێك دەداتەوە و ئەوەی دێتە بەر چاو کە شەماڵ بە پێچو پەنایەو لە ترسی ئەوەی نەوەك کاغەزەکەی لەم پێچو پەنایە بزر بێ ، دێ لە بڕیارەکەی پێشووی دێتە خوارەوە و لە قسەکەی بەرایی پەشیمان دەبێتەوە و بڕیارێکی تر دەدا کە ئەم بڕیارە تازەیە بڕیارەکە و قسەکەی پێشوو تووت دەداو دەی سڕیتەوە ، کە دەڵێ ( نایدەم بە شەماڵ ) ئەمە سەرەتای پەشیمان بوونەوەیە ، کە پەشیمانیش بووەوە دەبێ چارەیەکی تر بکات و ڕێگایەکی تر بدۆزێتەوە بۆ ناردنی کاغەزە خوێناوییەکە ، چارەش هەر ئەوەیە کە دەڵێ : ( بە خۆم بۆی ئەبەم ) هۆی ئەم بڕیارە نوێیەش بەوە لێك دەداتەوە ، کە دەڵێ : ( داخم لە دڵایە ) واتە ئەم داخە گەرمەی دڵیەتی وای لێ کردووە کە متمانە بە ( شەماڵ ) نەکات و خۆی کاغەزەکەی بۆ یار بەرێت .

نالی دەڵێ :

وەرە بنـــوارە دوو دەستی خـەناویت
خەناوی چی ؟ هەمووی هەر خوێنە قـوربان

سەرەتا ( نالی ) دەمی قسە دەکاتە یارەکەی‌و پێی دەڵێ سەیری دوو دە-
خەناویەکەی یەکەی خۆت بکەو لێیان وورد بەوەو بزانە چۆن لە خە:
هەڵکێشراون . بەڵام ئەوەندە نابات کە لـــە نیوەی دووەمدا یادەداتەو.
قـەی پێشووی دەخواتەوە و شتێکی تری لـە شوێن دادەنێ . . ئەوکاتە
کە دەڵێ : خەناوی چی ؟ واتە دەستەکانت خەناوی نین . . چونکە ئـ
پرسیار کردنە پرسیاری نکوڵیە ـ استفهام انکاری ـ ئنجا کە دەستەکا
خەناوی نەبێت ، دەبێ شتێکی تر هەبێت دەستەکانی وا سوور هەڵگێڕا
ئەو شتەش دیارە خوێنەو دەڵێ دەستەکانت ( هـەمووی هەر خوێنە ) .

سەلام دەڵێ :

باسی شەوتان بۆ بکەم جـاری لە ژووری نووستنا
ژووری چی ؟ خانوو لە کوێ ؟ بەخوا کوڵانە سەک ئەڵێم

کەواتە بە کورتی یادانەوە بریتیە لەوەی کە هۆنەر یا نووسەر لە پێشـ
قـەیەك بکات و فەرمانێك بدا ، کەچی ئەوەندەی بـە سـەردا نەچێ ا
قـەیە پاشگەز بێتەوە و یـەکێتیەوەو قـەیەکی تر رەپێش بکاتو لەجێ
قـەی پێشووی دابنێ ، ئەمەش هەمووی بۆ جوان کردن و شەوق پێدا
هێز بە راخستنی هۆنراوەکە .

ئەو تام و بۆ و ئەو جـــوانی و خۆشیەی کە لەم پیشە نایابە
هەڵدەقوڵێ لەوەوە دایە کە لە پێشا شتێکی وا دەڵێ کە بە لای خۆیا
زۆر دوورە لە راستی و وا پیشان دەدا کە بە هەڵەو بێ دەستی خ

بە سەر زمانیدا تێپەڕیوە و لە دەمی دەرچووە ، بۆیە کە هۆشی دێتەوە بەر و هەست لە خۆی و لە قسەکەی رادەگری پەشیمانی دەکێشێتەوە و دەڵێ نەخێر وانی‌یە ، ئەم قسەیەی کە کردوومە لە سەر زمانمدا ترازاوە و فری بە سەر راستی‌یەوە نی‌یە ، ئنجا بە شوێن ئەم بادانەوەیەدا راستی چۆنە ـ بەلای خۆیەوە ـ وای دەخاتە روو .

لە گەڵ ئەم هێنان و بردن و ئەم قسەکردن و پەشیمان بوونەوەیەدا بیرو هۆشی گوێگر دەکەوێتە لەرینەوە و هات و چۆ ، یەکەم جار بۆ لای شتێك دەچێ و بە سەریەوە دەنیشێ کەچی کت و پڕ لەوێ هەڵدەفڕێنرێ و لە شەقەی باڵ دەدات و بۆ سەر چڵی درەختی مەبەست دەکەوێتە رێ . بەم جۆرە ئەم هێنان و بردنە دەرگای خۆشی لە پیاو دەکاتەوە و دەیخاتە دونیایەکی گیانی پڕ کامەرانی‌یەوە .

وا بۆ نموونە حەیرانێك دەخەینە بەر چاو کە ئەم هونەرەی زۆر بە جوان و نەزاکەتی تێدا دەدرەوشێتەوە :

« برایینە ! برادەرینە ! ئەگەر ئەمن مردم ئەت مەرێن درەنگە . قەبرەکی لۆ من لێ بدەن لە مەعبەینی سینگ و مەمکێ نازدار حەیرانێ ، بەران توخوا لێ مەدەن بە کورنگ و بیران چونکی بیرازی گەلە تەنگە . .

لە بۆم گاز کەنە کۆرپەکانی مەمك نەهاتی ، نەوللا سووکە ژنەکانی دەس بە بازن ، دەبا بێنەوە سەرێنێم شینەکەم لە بۆ بکێڕن بە ئاوازو دەنگە . (١) . . . »

---

(١) رسول گەردی لە لاپەڕە (٢٦) ی [ بژار ] دا ئەم حەیرانەی نووسیوە بەڵام نەختێ جیاوازی لە گەڵ ئەم حەیرانەدا هەیە . .

# — راگوەکی ئاشنا —

راگومکی ئاشنا وا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر شتێکی دیارو ئاشکرا
زانراو بێنێ ، جا بۆ نوکتەو جوانی ، یا بۆ پێ لێ هەلبڕینو هووشەکا،
خۆی لە شتەکە خەشیمو نەشارەزا بکا ، وەك هەر نەیدیبێ و نەیناسیبێ
بە زۆریش وا دەبێ کە بکەوێتە بەرگی پرسیارەوە . . بێ گومان یە
کە پرسیار لە شتێ دەکا ، دیارە ئەو شتە نازانێ ، یا دەیزانێ و نک
دەکا ، یا بۆ خۆ خەشیم کردنە . . جا کە پرسیار دەکا بۆ ئەوەیە
شتەکە بزانێ ، ئەوەش وا دەکەیەنێ یا وا پیشان دەدا کە کابرا شتە
نەزانێ لە جوانکاری دا ئەم هونەرە بە پرسیار دەردەبڕێ و پرسیارەکە و
پۆشی‌یەکی لێ دێنێ ، بۆ ئەوەی لە پەنا ئەو پۆشی‌یەوە خوێنەر یا گوێ
هەلبخەلەتێنێ و وای بیاتە دلەوە کە نەشارەزایەو پرسیارەکەی لە دلەوە
و بۆزانینی شتەکەیە . . واتــە خۆی شتەکە زۆر چاك دەزانێ بـەلام
پرسیار دەکا پرسیار کردنەکەی هەر بۆ ئەوەیە کە خوێنەر وابزانێ
شتە کە نازانێو ئاگای لێ نی‌یە .

وەفایی دەلێ :

سەروە یـا شمشالـە یـا خۆ عـەرعـەر یـا نـارەوەن ؟
یـا چنارە یـا کـەتوبـای قـامەتی دلــداریــە ؟
نوختەی ئـایاتی قورئـان یـا نەهێندوی خەتی تۆ ؟
یـا سەوادی عەینە ، یا خۆ خـالی سەر روخـاری‌یە ؟

ئەم هۆنراوە هەمووی و ئەم دیارەی سەرەوە بە تایبەتی تا دەرك و لێوان

هوروشەكارى و پیشەیی « راكومكی ناشنا » هەلاّخنراوە . . لە دیری یەكەم
( وەفایی ) قامەتی وەك تووله نەمامی یاری دەكەویتە بەر چاو ، خۆی سوور
دەزانی كە ئەمە بەژن و بالاّی بلندی یارەو هیچی تر . بەلاّم ئەوەندەی لا
پەسندو رنك و پیك و رازاوەیە دلی هەلناكری راستەو راست ورەپ
بلیّ ئەمە بەژنی یارە ، بەلكو دێ خۆی نا ئاشنا دەكات و وەك نەشارەزایەك
دیتە پیشەوە ، و دەلیّ : من كە ئەو نەمامە بەرزەم دیوە سەرم سورماوە
نازانم ئاخۆ ( سەروو ) ، وا لووس و باریك هەلچوە ؟ یا شمشالە وا دریژو
باریكە و ئاوازیكی نەرمی نیینێ لیّ هەلدەسیّ و پەردەی كونچكەی دل
دەلەرینیتەوە ! یا خود داری عەرعەرە ؟ كە عەرعەر داریكی جوان و پەوزو
بۆن خۆشە . . یا نارەوەنە ؟ . یا چنارە ؟ كە وەفایی ئەم هەموو شتانە
دینێ و دەلیّ ئایا ئەوەی من دیومە بەژنی یارە یا یەكیكە لە مانە ؟ دیارە
بەم پرسیار كردنە دەیەویّ وا پیشان بدا كە بەژنی یار ئەوەندە جوان و
بە نەزاكەتە ! بە كەل ئەو شتە جوانانە تیكەل بووە و وەفایی نایناسیتەوە ،
كە نەشی ناسیتەوە دیارە دەبێ پرسیار لەم و لەو بكا تا بتوانێ وەلاّمیكی
دەست كیر بێ و بەم وەلامە بەژنی یار لەوانەی تر جودا بكاتەوە . . چونكە
پرسینەكە خەشیمایەتی رووكەشی كابرا دەردەخا ، ئەم خۆ خەشیم كردنەش
هیزو كۆرو تەوژمیكی زۆر بە تینی تیا دە كەرێ .



## — راگوەکی ئاشنا بۆ زۆر مەبەست دەبێ —

بێگومان هونەر یا نووسەر کە ئەم پیشە جوانکاری‌یە دێنێ و پە دەباتە بەر بۆ دەربڕینی‌هەستی هەڵچوی هەناوی ، دەبێ لـــە دوای با هێنانی ئەم هونەرە جوانەوە مەبەستێك یا چەند مەستێك هەبێت ، ئەم هەندێ لەو مەبەستانەی کە ( راگوەکی ئاشنا ) خزمەتیان دەکات :—

١ — **هووشەکاری** : یەکێ لە نیشانەکانی ـ راگوەکی ئاشنا ـ ئەوا کە بە تەواوی لە دەریای هووشەکاری نقووم دەبێت‌و هەر ئەو هووشەکار پەشە کە بتوانێ هەستی خوێنەر بۆ ئـاسمانی بەرزی خەیـــال بفرێنێ سەرەداوێکی مەبەستی بداتە دەست‌و بۆ کرووزی سووتانەوەی بەندی چکا بە لوونا بکەیەنێ . . .

حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

لێت دەشێوێ هەر کە زولفەینی پەشێوی لا بدا
ماهتابی سەرکەلە یا رۆژەکەی سەر بستووە

[ حـاجی ] نیگای چاو خومـارێك مەستی کـردووە ، شەربەتی چ کولێك سەرخۆشی کردووە ، باڵای خۆش پەیکەرێك روو خۆشی کردو وای داناوە کە ئەوەی رووی تێ کردووەو دەسك دەسك تیشکی سەر ووردی بۆ دەملوێ وەك ماهتابی سەر کەل یـا رۆژی سەر بستوو وا بۆیە ئەمانەی هەموو لێ تێکەل دەچێ و نـــازانێ کامەیـان کامەیە . ئێمەش لێرە دا نەختێ بـەنگلێنەوە و سەیرێکی ئـەو پەیکەرە بکەین حاجی لە بەر دەمی خۆی‌دا چەقاندوویەتی‌و وەك رووکە رووی تێ کردو

که ئەویش شۆخێکی بەدەن ناسکی وەك ئاسکە ، دوو زولفە رەشەکانی بە سەر دوو شەوچراغی بەهەشتا لەنجە دەکەن . . جا دەڵێ : ئەگەر بێت و ئەو نازدارە داوی رەشە زوولفەکانی لە سەر روخساری گەشی پڕ رەونەقی لابدات بە جارێ لێت دەشێوێ ، تا خۆ چی بوو لە ژێر ئەم داوە خاوانە دەرکەوت ؟ ئەلبەت تۆ هەر ناچی بۆ لای روخساری یار ، بەلکو لێت دەشێوێ‌و واقت وور دەمێنێ چونکە نازانی ئایا ئەو شەوقە شەوقی مانگی سەرکەلە ، یا ئەو تیشکە تیشکی رۆژی سەر بستووە . تەماشای بیری ووردو خەیالی تیژی حاجی بکە چۆن لە مانگ مانگی سەر کەلو لە رۆژ رۆژی سەربستووی دۆزیوەتەوە ، هووشەکاری‌و پێ ئان هەڵبڕین لەم هۆنراوەیەدا لەوەدایە کەخۆی خەشیم‌و نەشارەزا دەکاو ئەو نەشارەزاییەش بە پرسیار پیشان دەدا ، ئەگینا خۆ لە من و تۆ باشتر دەزانی ئەوەی کە دیویە روخساری یار بووە نەك مانگ‌و رۆژ . . یــــا وەکو ئەم پارچە هۆنراوەی خوارەوە کە ( کامەران ) لە فارسی‌یەوە وەری‌گێڕاوە .

بەژنی تۆ یا بەژنی ڤینۆس ئەی فریشتەم شەنگترە ؟
خونچە تەنگتر ، یا دەمی تۆ ، یا دلی من تەنگترە ؟
چاوی کالی پڕ لە ووروشەت یا کەلاوێژ گەشترە ؟
خالی گۆنای ناسکت یا بەختەکەی من رەشترە ؟
دەنگی دلبزوێنی تۆ ، یا شیعری من پڕ سۆزترە ؟
پەرچەمی رەیحانەییت یــــا رۆژگار ئالۆزتــــرە ؟
عەشقی من یا کیانی ســــاوا یا فــریشتە پاکترە ؟
ژینی جیایی ، یا مەرگت کامیان لە کامیان چاکترە ؟

## ٢ ـ برژان بە گڕی خۆشەویستی‌یەوە :

نالی لە تاك ڕەکەزێك دا دەڵێ :

صوتی نەغمەی بولبولە ؟ یا چەهچەهەی خرخالی‌یە ؟
دەنگی سۆلە ؟ یا لە ژێر پێی نالە نالی نالی‌یە ؟

( نالی ) ئەگەر ئاوازێکی بەر گوێ کەوتبێ زانیویە ئەمە چەهچەهەی دەنگ ئەوا خوانی بولبول نی‌یە ، ئـەگەر چیرە چیرێکی بیستبێ سوور زانیوە ئەمە ئاوازێکەو لە کەوشی بێ خەوشی یارەکەیەوە هەڵدەستێ ، بەڵام : ئاوازە بۆ جەرگت هەڵقرچاوێکی وەك ( نالی ) شتێکی ساکارو بێ نرخ نی‌یە کە بە مەرێزەی ئاگری دڵداری هەڵقرچاوەو دامرکاوەتەوە . . جا دەربڕینی ئەو سروتانەو هەڵقرچانو داقرچانە ( نالی ) دێو خۆی خەشی ئایەلەد دەکا کە دەڵێ : ئایا ئەوەی بیستم ئاوازی بولبولە ؟ یا خرنگ هۆڕی خرخالە ، یا خشە . خشی سۆلە ، یا ناڵە نالی ( نالی ) یە کە ژێر پێی یاردا کەوتوەو یارەکەی سەروکوێلاکی پایەمال دەکات و ئـ دەنگەش کە دەکەوێتە بەر گوێ دەنگی کرووزانەوەیەتی ؟ بێ گومان جۆرە پرسین و خۆ نەشارەزا کردنە ، کە کەوتۆتە پێشتی پرسیارەوە پەڕی سروتانو برژانی نالی پێمان دەدا بە گڕو بڵێسەی خۆشەویستو

## ٣ ـ بۆ خوسپو داشۆرین :

وەکو یەکێ کە دوژمن و ناحەزو نەیارەکەی بە هیچ هەڵنەگ بە سووکی تەماشای بکات و لە کاتی باس کردنیشی بڵێ : « بە خ

نازانم ئەوانە ژنن یا پیاون ؟ » بەڵێ دەزانی کە ئەمانەی ئەو مەبەستی‌یەتی پیاون ، بەڵام کە خۆی لەو راستی‌یە گێل دەکا هەر بۆ ئەوەیەتی وا پیشان بدا کە ئەم جۆرە کەسە ( پیاوە ) لە گەڵ ( ژنان ) جیاوازی‌یان نی‌یە . . پرسیارەکەش یا خۆ گێل کردنە یا خزمەتی دەرخستنی ئەو داشۆرینە دەکا .

* * *

## — هووشەکاری —

ئەوەیە کە نووسەر یا هۆنەر باسی شتێك بکات‌و لەو باس کردنە بە تەواوی پێ‌ی هەڵببڕێ و هووش بکاتێ . .

( کوردی ) دەڵێ :

گەردنی کـــوردی لە کێوی بێستوون مەحکەم ترە
چونکە سەد ساڵە لـە ژێر باری غەمایە و ناتەوێ

باسی توندی و مەحکەمی گەردەنی خۆی دەکات ، لە بـــاس کردنەکە ئەوەندە پێ لێ هەڵدەبڕێ کە دەڵێ کێوی بێستوون کـــە لە بەر تیشـ قولنکی ئەرهـادا خۆی راگرت نـاکاتە گەردنی من لە توند و پتەوی دا سەبـارەتێکیش بۆ ئەم پێ لێ هەڵبـڕینە دینێتەوە و بەوەی لێك دەداتە کە گوایە گەردنی ئەو سەد ساڵێ رەبەق لە ژێر بار گرانی غەم دا بووە ئەچەماوەتەوە ، کە سەد سالێش خۆی بە رووی غەمەوە راگرتبێ‌و ئەچەما دیارە دەبێ لە کێوی بێستوون مەحکەم تر بێ ، ئەگەر لـەو مەحکەم ئەبوایە ئەم سەد ساڵە خۆی پێ لە ژێر باری غەم‌دا رانەدەگیرا .

هووشەکاری پلەی زۆرە ، لە مانە تەنیا دوویان باس دەکەین :

١ — وا دەبێ هووشەکاری‌و پێ لێ هەڵبـڕینەکە لە سنووری ئەقل‌و ئەریـ ـ العقل والعادة ـ تێ ئەپەرێ ، واتە هەم بچێتە ئەقلەوەو هەم بووش بە رەوشت و ئەریت . .

سەلام دەڵێ :

خوا ئەزانێ من بـە رەنگێ عاشقی روخسارتم
لەت لەتم کەن بمکوژن هەر ناعیلاجم بێمە لات

ئەم هووشەکاری‌یە دەچێتە ئەقلەوە ، چونکە بۆی هەیە ئاگری دلداری ؛

چۆرێ دلی سووتاندبێ و هەناوی جۆش دابێ و جەرگی لەت لەت کردبێ کە بشیکوژن و بە خەنجەر لەت و پەتیشی بکەن ئەم هەر واز نەهێنێ و موکوڕ بێ لە سەر چوونە لای یار . . وەکو ئەمە ئەقل دەیگرێ و بڕوا دەکرێ ئاواش زۆر جار بووەبە رەوشت و نەریت ، چونکە کەلێ جار وا تەوماوە کە پیاوێك لە پێناوی روومەت کوڵێکا خۆی بەخت کردووەو شەت و پەت کراوە . . یا وەکو ئەم دێرە هۆنراوەی خوارەوە کە دەڵێ :

با سەریشم دابنێم مکن نی یە دەست هەڵگرم
خوا منی بۆ ماچی ئەو لێوانە ئەوسن کردووە .

٢ — وا دەبێ پێ لێ هەڵبڕینەکە ئەستەم و موستەحیل بێ ، نە ئەقل بیگرێ و نەبووش بێ بەرەوشت . شێخ رەزا دەڵێ :

هەزار هەوسارو دەس پێن و کوریسی لێ دروست ئەکرێ
بە سەد باتمان خوری گەر بیکری هەرزانە ئەم ریشە

جارێ هیچ ئەقلێك ئەوە قەبوڵ ناکا کە ریشی پیاوەهەر چەندە بەر بدرێتەوەو درێژ بێ بایی ئەوە بکا کە یەك هەوسار نەك هەزار هەوسارو کوریس و دەس پێنی لێ دروست بکرێ ، یا ئەگەر بێتو بخرێتە مەزات و مامڵەت ، بە هەزار باتمان خوری بکڕێ و هێشتا هەرزانیش بێ . . چۆن ئەمە بەر ژیری ناکەوێ وانە ئەقل نایبڕێ ئاواش نەبووە بە رەوشت و نەریت ، کە یەکی بچێ ریشی ریشدارێك بێنێ و کۆی بکاتەوە و شەی بکات و بیڕنێ و بای بداتەوەو هەزار هەوسارو دەسپێن و کوریسی لێ دروست بکا . . یا بچێ تۆپە ریشێك بە سەد باتمان خوری بکڕێ و هێشتا هەر قازانجیشی بێت . ئەمەیە پێ لێ هەڵبڕینی زۆر و هووشەکاری بێ ئامان .

## — تێلنیشان —

( تێلنیشان ) ئەوەیە کە هۆنەر لە هۆنراوەکەیدا هێما بۆ داستان یا کارەسانێك یا پەندێکی پێشینان یا ئایەتێکی قورئان بکا .

ئەو هۆنراوانەی کە پیرەمێرد دەربارەی پەندی پێشینان دایناون ، هەمو بەر ئەم هونەرە دەکەون (١) وەکو دەڵێ :

بەڵام کە لە پڕ هاتی بروی بە کوڕ
نـان خـۆری دەبی سپلەی سفرەدڕ

ئەم هۆنراوەیە ئیشارەتە بۆ ئەو پەندەی کە دەڵێ ( کەس لە پڕ نابێ بە کوڕی ) . .

( بەکر کەردی ) دەڵێ :

بە ملەوەزی مەڕۆ ناو شاران
هەمو کەوارەك نـایێتە باران
زەمین بخنکێ یـا بـروێ کشت
کەس نالێ سامال پشکێ ناوی ڕشت

ئەوەش ئەو پەندە دەکرێتەوە کە دەڵێ : ( لـە هەمو هەوران هەر باران نییە . )     نالی دەڵێ :

مطمئن خاطرو ئەیمەن مەبـە هەرگیز لـە شەڕی
نەفسی ( أمارة ) کە ئەم مارە لە گەڵ تۆ شەڕیە

لێرەدا هێما بۆ ئەو ئایەتـــە پیرۆزە دەکا کـە دەڵێ « ان النفس لأمارة بالسوء . »

---

(١) کاکەی فەلاح تا ئێستا سێ بـــەرگی لـــەو پەندانەی پیرەمێرد کۆکردۆتەوە و بەناوی (لە پەندەکانی پیرەمێرد ) ، وە چاپی کردوون .

یـــا ئەوەتە هێما بۆ داستان و کارەساتێك دەکـــا وەکو هەژار دەڵێ :

لـە تاریکایی پـرچت بێ سەرەوبەر
دڵم کێژو هوڕە چەشنی سکەندەر
بەڵام ئاوی ژیان لاجانگی تۆیـــە
بەڵام ڕەشماری بسکت بۆتە لەمپەر

لە پەنا ئەو هەست دەربڕین و لێکچواندنە شیرینە ، هەژار هێما بۆ داستانی ( ئەسکەندەر و خدر ) دەکا ، کـە چوون بە شوێنی ئاوی ژیان ( مـــاء الحیاة ) دا بگەڕێن ، ( خدر ) ئاوەکەی دۆزیەوە و خۆی تیا شـوشت و لێی خواردەوە ، بەڵام ئەسکەندەر ، چۆن چوو وا گەڕایەوە . . ئەمە وەك داستانەکە دەی گێڕێتەوە .



## — روون کردنەوە —

ئەوەیە کە هۆنەر یا نووسەر لە پێشا قسەیەك بکا یا باسی شـ بکا ، ئنجا بە دوای ئەوەوە قسەکە روون بکاتەوە و لێکی بداتەوە خوێنەری ئاشکرا تر بکا .

نالی دەڵێ :

خاڵت چیە ؟ دانەی گەنمی جەننەتی روونە
چاوت چیە ؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەی ئەبرۆ

لە پێشا ناوی خاڵی هێناوە ، یا ویستوویەتی باسی خاڵ بکا ، لە بەر ئەوەی ئەوەك گوێگر نەزانێ ئەم خاڵە چ خاڵێکە . یا بەشتێ بە نرخی نەزانێ دێ باسی ئەو خاڵە دەکات و بۆ خوێنەری روون دەا کە ئەو خاڵە چیە و دەڵێ : ئەو خاڵە دانە گەنمێکی جوانەو کە بەهەشتی رووەتی یارەوە .. لە نیوەی دووەمیش کە ناوی چاوی برد هاتووە باسی دەکاو زیاتر روونی دەکاتەوە کە چیەو چ سیحرو ئەفـ تەلەسمێکی تێدایەو دەڵێ : ئەم چاوە گەشە فیتنەی حەرەمی قیبلەی ئا یارە . . هەروەها دەڵێ :

ئەسیری سیلسیلەی بەندی مەساری سەرقەتـارت بم
کە دەمکێشیتە روضەی حی وەکو مەجنونی دیوانـە
چ روضە ، روضەی جەننات ، چ جەننەت جەننەتی توربت
چ توربەت تورْبەتی راحەت ، چ راحەت راحەتی جانە

نالی ووشەی ( روضە ) ی هێناوە ، جا لە بەر ئەوەی ئەوە شتێکی بەم ووشەیە مەبەست بێت و خوێنەر بە شتێکی لێك بداتـ

هاتووە خۆی ووشەکە روون دەکاتەوە و دەڵێ ئـــەم رەوضـەیە ، رەوضەی بەهەشتە . . دیــان بەهەشتەکەش روون دەکاتەوە و ئەوە دەردەخا کە بەهەشتی نزیك بوونەوەیە ( قوربەت ) . . ئەو نزیك بوونەوەیەش هــــەر شەرح دەکاو ئەوە دەردەخا کە نزیك بوونەوەی ئیــراحەت و پشوودانە ، ئەو جۆرە راحەت و ئیــراحەت و پشوودانەش هەر روون دەکاتەوە کە دەڵێ راحەتی گیانە . .

مەلا عمدی کۆیی دەڵێ :

وەزیفەی زۆر گەورەیە ، دەزانی ئەویش چی‌یە ؟
منداڵ بوون و تەربیەت ، بێ مەسخەرەو جنێودان

باسی دایك دەکات و دەڵێ وەزیفەی دایك ( ژن ) زۆر گەورەیە ، جا لە بەر ئەوەی ئەوەك خەڵکەکە نەزانن ئەم وەزیفە گـەورەیە چی‌یە ، دێ رووی پرسیار قیت دەکاتەوە و دەڵێ « دەزانی ئەویش چی‌یە » دیــارە هەر خۆیشی وەڵام دەداتـەوە و بەم وەڵام دانەوەش وەزیفەکە روون دەکاتەوە و بۆ خوێنەری ئاشکرا دەکا کە بریتی‌یە لە منداڵ بوون و بەخێو کردن و پێ گەیاندنی ئەم منداڵە بە شێوەیەکی رێك و پێك .



# — کۆکردنەوە —

کۆکردنەوە وا دەبێ کە کۆمەڵە شتێك پێکەوە کۆبکەیتەوە هەموویان بخەیتە ژێر فەرمانی حوکمێکەوەو یەك فەرمانیان بەسەردا ببڕێ
حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

کتێب و دەفتەر و تاریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زمانی

مەلاو زاناو پیرو پادشامـــان
هەتا مەحشەر دەما ناوونیشانی

لە دێڕی یەکەم چوار شتی لە یـــەك فەرمان دا کۆکردوونەتە ( کتێب ـ دەفتەر ـ تاریخ ـ کاغەز ) ، کۆبوونەوەکەشیان لەوەدایە هەموویان بە کوردی بنووسرابوونایە . . لە دێڕی دووەمیش چوار جۆر کەسی هێناوە ( مەلا ـ زانا ـ پیر ـ پادشا ) کە لە مانی ناوونیشان ڕۆژی حەشر هاوبەشی کردوون . دیارە ئەم مانەوەش هەر بەوە دەبێ نووسین و خوێندەواریمان بە کوردی بێت .
گۆران دەڵێ :

قەلا ، تەلبەن ، شـــورا ، سـەنگەر
حەیوان ، ئینسان ، شـــاری ، عەسکەر
ژن پیاو ، پیر جوان ، دەست قاچ ، سنگ سەر
پێ شێـــل کە هەرچیت هاتە بـــەر

ئەمە دوو دێڕە لە پارچەیەکی دوور و درێژ کە لە ژێر نــاوی ( دیاری خوای شەڕ ) هۆنیویەتەوە ، کۆران ناوی کۆمەڵە شتێك دەبــا ( قەلا ـ ئەلبەن ـ شورا ـ سەنگەر ـ حەیوان ـ ئینسان ـ شاری ـ عەسکەر ـ ژن ـ پیاو ـ پیر ـ جوان ـ دەست ـ تــاج ـ سنگ ـ سەر ـ ) هەموویان پێکەوە کۆ دەکاتەوە و روو لە خوای شەڕ دەکات و دەڵێ هەر کامێك لە مانەت هاتە بەر پێ شێلی کە . . دیارە ئەم هەموو شتانە لەوەدا کۆبوونەتەوە کە خوای شەڕ بێت و پێ شێلیان بکات .

حەریق دەڵێ :

روح ، دڵ و دین ، هەرسێ بە مجموع بە یەك دەفعە
قوربــانی سەعلتێکی لەعلی لەبی مەرجــانت

حەریق ( روح ـ دل ـ دین ) هەر سێکیانی لەوە کۆکردۆتەوە کە ببن بە قوربانی لەعلی لێوی یار . وەکو چۆن کۆکردنەوە لە ( ناو ) دەبێ ئاواش لە ( کردار ) دا دەبێ ، کۆران روو دەکاتە خوای شەڕو پێی دەڵێ :

پەلاماردە ، دەست و بــردکە !
بکرە ! بیرە ! بدڕە ! ووردکە .



## — لێك كردنەوە —

لێك كردنەوە بە تەواوی پێچەوانەی کۆکردنەوەیە .. لە کۆکردنەوەدا دوو شت یا پتر پێکەوە لە فەرمانێك یا خاسەوێژێك‌دا کۆ دەکرێنەوە کەچی لێرەدا دوو شت یا زیاتر کە پێکەوە دێن لێك دەکرێنەوەو جیاوازی نێوانیان دەخرێتە روو . شێخ رەزا دەڵێ :

تۆ هەتە تیغی دەبانو من هەمە تیغی زبان
فەرقی ئەو دوو تیغە هەر وەك ئاسمان و ریسمان

دیارە لێرەدا شێخ رەزا جیاوازی خستۆتەوە نێوان تیغی تیژی زبانی خۆی، تیغی دەبانی کابرا ، کە تیغی دەبانی کابرا بە چاو تیغی زبانی شێخ هەر هیچ نی‌یەو جیاوازی‌یان وەك ئاسمانو ریسمان وایە .

نالی دەڵێ :

شیعری خەڵکی کەی دەکاتە شیعری من بۆ نازکی ؟
کەی لە دیقەت‌دا پەتك دەعوا لە گەل هەودا دەکا ؟

ئەمانە هەردووکیان پرسیاری نکولی - استفهام انکاری - ن لە هەمان کات‌دا نالی جیاوازی بەینی شیعرە وردەکانی خۆیو شیعرە زبرەکانی خەڵکی دەردەخاو بە چاو تلیمیو بە شانازی‌یەوە ئەو راستی‌یە دەداتە بەر گوێ: خەڵك کە شیعری خەڵك بە شیعری ئەو ناکەن ، ئەم جیاوازی‌یەی نێوان شیعری خۆیو شیعری خەڵکی بە لێکچواندن روون کردۆتەوە ، چۆن پەتك ناتوانێ لە بارەی ووردیو باریکی‌یەوە پەنجە لە پەنجەی هەودا - داوەدەزی - بدات ، ئاواش شیعرەکانی خەڵك ناتوانن خۆیان لە قەرەی شیعرەکانی ئەو بدەن جیاوازی شیعری خەڵكو شیعری ئەو وەك جیاوازی پەتکە کوریسو داوەدەزی وایە .

## — کۆکردنەوەو لێك کردنەوە —

کۆکردنەوەو لێك کردنەوە هەر وەکو لە ناوەکەی دا دەردەکەوێ بریتی‌یە لەوەی کە دوو شت یا پتر لە ژێر فەرمانی شتێك‌دا کۆبکەیتەوە، پاشان دوابەدووای کۆکردنەوەکە لە فەرمانێکی تر یا لە بارەیەکی ترەوە جیاوازی نێوانیان دەربخەی‌و لێکیان بکەیتەوە .

نالی دەڵێ :

هێنـــدە پێم خۆش بوو زمـــانی حالی ئەیوت ئالیـا
هەردوو حەیوانین ، ئەتۆ گوێ کورت‌و ئەمنیش گوێ درێژ

ئەمە زمانی حالی گوێ درێژێکەو نالی بۆ من‌و تۆی دەگێرێتەوە ، وکوایە ئەو راستەقینەی درکاندووە کە نالی ـ مرۆڤ ـ و گوێ درێژ ـ وولاخ ـ هەر دووکیان حەیوانن . هەرواشە هەردووکیان حەیوانن . کەواتە لێرەدا کۆکردنەوەیەك بەدی دەکرێ لە نێوان نالی‌و گوێ درێژەکە ئەویش بوونی هەردوولایە بە حەیوان . . بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێ پاش ئەم کۆکردنەوە لێکیان دەکاتەوەو جیاوازی‌یان دەخاتە مەعبێن ، جیاوازی‌و لێك کردنەوەکەش لەو بارەوەیە کە وایە هەردووك حەیوانن بەڵام یەکێکیان گوێ کورت ـ نالی ـ و ئەوی تریان گوێ درێژە ـ وولاخەکە ـ . .

تا بەم جۆرە وەك بۆمان دەرکەوت و ساغ بووەوە نالی لەم هۆنراوەیە دا هاتووە لە پێشەوە دوو شتی لە فەرمان‌و خاسەوێژێك دا کۆکردۆتەوەو کەیاندوونیەتە یەکتر ، ئنجا پاش ئەم کۆکردنەوەیە راستەوخۆ لێکی کردوونەتەوەو جیاوازی نێوانی پێشان داون . ئەدەب دەڵێ :

چیهرەو دەمەنی وەك گوڵە ئەما بە تەفاوت
یەك سوورەیی خەندان‌و یەکێ خونچە بەتەنگی

که دەڵێ : « چیهرەو دەمەنی وەك گوڵە » مانای وایە ئەم دوو ئەندامە نەرمو ناسکەی یار ( چیهرە ـ دەمەن ) پێکەوە لە خاسەوێژێك دا کۆ دەکاتەوە ، کە هەر دووکیان وەکو گوڵ وان . . کەچی بە دوای ئەمەوە جیاوازیەکیان دەخاتە نێوانو دەڵێ وایە هەر دووکیان واتە ( چیهرەو دەمەن ) ، کە وەکو گوڵ وان بەڵام لە گەڵ ئەمەش دا هەندێ جیاوازیان هەیە ، جیاوازیەکەش لەوەدایە کە یەکێکیان ـ مەبەستی روخسارە ـ سوورەیی خەندانە و ئەوەی تریشیان ـ مەبەستی دەمە ـ خونچەی تەنگە .



## — دابەش کردن —

دابەش کردن وا دەبێ کە لە پێشەوە دوو شت یا پتر بینیت ، ئنجا بە شوێن ئەوانەوە یەکە یەکە بۆ شتی تریان بیەیتەوە کە پەیوەندی‌یان پێوە هەبێ . . واتە هەر یەکێکیان بدەیتە شتێکو ئەوەش دیار بکەیت کە کامەیان بۆ کامە دەچێتەوە . .

احمدی خانێ دەڵێ :

دەعوا خو دکر بە دەست و ئەزمان
دەستی وی بە سەیفو دەڤ بە قورئان

لە پێش دا دوو شتی هێناوە « دەست ـ زمان » ئنجا ئەمانەی هەر یەکە بۆ شتێك بردۆتەوە ، هەردووکی بۆ ( سەیف ـ قورئان ) بردونەتەوە ئەویش دەست نیشان کردووە کە ( دەست ) ، کە ( سەیف ) ی تێدایەو ( دەم ) کە شوێنی ( زمانە ) قورئانی تێدایە . . . واتـــە لە پێش دا ( دەست ـ زمان ) ی هێناوە ، ئنجا ( سەیف ـ قورئان ) ی هێناوەو ئەم دووەی بەم دوایی‌یەی بە سەر دووەکەی بەرایی دابەش کردووەو لە دابەش کردنەکەدا ( سەیف ) بە بەر دەست و ( قورئـــان ) بە بەر ( دەم ) کەوتووە .

مەولەوی دەڵێ :

مەوج دجلەی چـــەم طغیـــان کەردەوەو
کێج هـــوون .دل جـــۆش ئاوەر دەوە
ئەو ســارای بەغداش ئـاوەردەن وەتـــەنگ
ئێد کـەردەن ســارای کەربلا رەنگ رەنگ

طفیان کەردەوە : دیــان هەلــاوەو لافاوی سەند ، گنج : پێچ و لوو
هوون : خوێن ، ئاوەردەن وەتەنك : بە تەنك هێناوە .. ئێد : ئەوەی
واتە : دیــان شەپۆلی دیجلەی چاوەکانم هەلــاو لافــاوی سەند ، بە
لوولی خوێنی دلم جۆشی سەندو کەوتەوە کەف و کول ، ئەویــــان
شەپۆلی ئاوی چاوەتی و وەك دیجلە هەلــاوە ، دەشت و ســارای بەغد
داگرت و بە تەنکی هێنا ، ئەوەی تریشیــان کە خــوێنی دلی جـــ
گرتوویەتی دەشتی کەربەلای کارەسات ئامێزی بــە خــوێن گولگون ک
سووری هەلگێرا . .
( مەولەوی ) لە پێشا دوو شتی هێناوە : « شەپۆلی ئاوی چاو ـ قــەل
خوێنی دل » بە دوای ئەوانیشەوە دوو شتی تری هێنــاوە کە پەیوەندی
بە مانەوە هەیـــــە « وەتەنك هێنانی ســارای بــەغدا ـ رەنگ کــ
دەشتی کــەربەلا » بەلام ( مەولەوی ) هەر بەوەندە ناوەستێ ، بەلکو
دووەی بەم دوایی‌یە بەسەر دوەکەی پێشوو دابەش دەکات‌و ئەوەدەر
کە وەتەنك هاتنی سارای بەغدا لە بەر هەلــانی دیجلەی چـــاوی
سوور داگەرانی دەشتی کەربەلا سەبــارەت بە هەلچوونی خـــوێنی
سەنـدووی دلیەتی .

هەر لە دابەش کردنەکە پیرەمێرد زۆر شارەزایە ، بێ گرێ‌و ت
بە شێوەیەکی زۆر رەوان و گەوارا ئــەم دیارە بە نرخــە رێك دەر
پێشکەش یاری نازداری دەکات‌و دەلێ :

کیانە وەنەوشە و چنــوور لــە کــــەل کــول
سەودای دیدەنی ئێویـــان کــــەوتــــە دل

چنوور لە کێوان ، وەنەوشە لە چەم

گوڵ لە گوڵستان یەکیان گرت سەرجەم

هاتنە لام وتیان : تۆ رابەرمان بە

ئەمەمان بۆ بکەو تاجی سەرمان بە

ئەوا هەرسێکم بەستن بە دەستە

هاتنە خزمەت بە دەستی بەستە

هەریەك بە رەنگێ مەرامی پێتە

بۆ نیازی خۆی خاکی بەر پێتە

چنوور بۆ زولفت لوول و پەشێوە

وەنەوشە مل کەچ خاڵی لاڵیوە

گوڵ کە نازکی گۆنای تۆی دیوە

چڵی خۆی لە ژێر پێی هەڵچەقیوە

تۆ پایە بەرزی شای شیرین ئەندام

با لەسایەتا بکەن بە مەرام

( پیرەمێرد ) چووە بە ناو باخ و گوڵزاردا گەراوەو چاوی دونیا دیتە و شارەزای خۆی یەکە یەکە بەم گوڵو گوڵوکانەدا گێراوە کە سروشتی بە پێی کوردستان لە دەمە دەمی بەهاردا گیانی بە بەردا کردوون و وەك تەوقێ بووکێنی لە سەر و زولفی خۆی داون . . . پیرەمێرد توانیویە بە چەشەی ناسك و زەوقی کوردانەی خۆی سێ جۆر گوڵ لەم هەموو گوڵانە بژێرێ و بیان چنێ « وەنەوشە ـ چنوور ـ گوڵ » کە دەیانچنێ پێکەوەیان

دەبەستن‌و دەیانکاتە دەسکە گوڵێکی قەشەنگ‌و پێشکەش یارەکەیان دەکات بەڵام چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەم گوڵانەو چۆنیەتی دەسك بەستنەکەو هەروەها چۆنیەتی پێشکەش کردنەکەی بە شێوەیەکی هونەرمەندانەی وایێشان داوە کە سیحرێکی رووتی تیا رشتووەو پیاو سەر سارم‌و سەرەنگەندە دەکات

دەڵێ : گیانەکەم ـ یارە نازەنینەکەم ـ من بە ئەنقەس نەچووم ئەم گوڵانەت بۆ بێنم و پێشکەشتیان بکەم ، بەڵکو گوڵەکان خۆیان ئارەزووی دیدەنی تۆیان پەرپیوە دل . . هەریەکیان لە شوێنێك دا بو ( چنوور لە کێوان ) ( وەنەوشە لە چەم ) ( گوڵ لە گوڵستان ) ئەما هەر سێکیان هەوای عەشقی تۆیان کەوتە سەر و لە داخان وا وێل سەر گەردان‌و ئاوارە بوون تا هەر سێکیان لە بەر کاریگەری ئەشقی تۆ بە یەك گەیشتن‌و یەکیان گرت . . کە یەکیشیان گرت روویان هەڵنەهێ راستەو راست بەرەو رووت بن . . بەڵکو پەنایان هێنایە بەر من‌و داوایا لێ کردم کە بیم بە رابەرو رێ نیشاندەریان‌و بیانهێنمە بارەگای شۆخی تۆوە ، بۆیە منیش وا هەرسێکم دەست بەستە کردن و هێنامنە خزمە تۆوە . . لەم هاتنەش دا ئەمانە هەر یەکەیان مرازێکی هەیە و مەرامێک تایبەتی پێتە ، هەر بۆیەش وا خۆیان کردوو، بە گەردی بەر پاتەوە ت مرازەکەیان حاسیل بکەیت و مەرامیان بەجێ بکەیەنیت . ( چنوور بۆ زولفت ) لوول و پەشێوەو ( وەنەوشە بۆ خاڵی لاڵیوت جەرگی داخ بووەو ( گوڵیش بۆ گۆنای ناسکت ) شێت و شەیداو سەر گەردان بووە . . دەتۆش ئەی شیرین ئەندام‌و شەکەر گفتار ، ماو ئەوەیان بدە کە لە ژێر سایەی پایە بەرزی تۆدا بە مەرامی دڵیان بگەن

لەم پارچە بە نرخەدا دوو جار دابەش کردن هاتووە .. لە پێشا کە ( چنوور ـ وەنەوشە گول ) دێنێ ، پاشان سێ شوێن دێنێ ( کێو ـ چەم ـ گولستان ) و ئەم شوێنانە بە سەر گولەکان دابەش دەکاو هەر یەکە شوێنێکی بەر دەکەوێ ( چنوور لە کێوان ) ( وەنەوشە لە چەم ) ( گول لە گولستان ) .. ئنجا لە دواوە سێ شتی تریش دێنێ ( زولف ـ خاڵ ـ کۆنا ) دیسان ئەوانەش بە سەر ( چنوور ـ وەنەوشە ـ گول ) دابەش دەکات‌و ( چنوور زولف ) و ( وەنەوشە خاڵ ) و ( گول کۆنا ) ی بەر دەکەوێ .



## ــ دابەش کردنو پێچان و کــردنەوە ــ

ئەگەر لە ( دابەش کردن ) و ( پێچانو کردنەوە ) وورد بینــەوە پێکچوونێکی زۆریان لە نێوان بەدی دەکەین ، چونکە لەم هەر دوو پیشە جوانکاری‌یەدا هۆنەر یا نووسەر لە پێشا چەند شتێ بە دوای یەکەوە ناو دەبا ، دوا بە دوای ئەوانیشەوە ناوی هەندێ شتی تر دێنێ کە پەیوەندیان بەوانەی پێشەوە هەیەو بۆ ئەوان دەگەرێنەوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە لە ( پێچانو کردنەوە ) دا هۆنەر یا نووسەر کە ووشەکانی دوایی دێنێ هەر بە رووتی دەیان هێنێ و لە تەنیشت یەکیان ریــز دەکا بەبێ ئەوەی دیــار بکا کە کامەیان بۆ کامە دەچێتەوە ، چونکە خوێنەر خــۆی لــە ناوەرۆکی باسەکەدا تێ‌دەگا کە کامەیــان پەیوەندی بە کامــەوە هەیە . . کەچی لە ( دابەش کردن ) دا هۆنەر یا نووسەر دەبێ یەکە یەکە ئەوە دیــار بکا کە کێهانیان بۆ کێهان دەچێتەوە ئەم دیار کردنو دیار نەکردنەش نیشانەی دابری نێوان ئەم دوو هونەرە جوانکاری‌یە یە .

سەرەرای ئەوەش وا دەبێ کە هۆنەر یا نووسەر دوو سێ ووشە بە دوای یەکەوە بێنێ . . پاشان دوو سێ ووشەی تر بێنێ کە پەیوەندی‌یان بەوانەوە هەبێ بەڵام ئــەوە دیار نەکا کە کامە پەیوەندی بە کامەوە هەیە ، بەمەوەش ( پێچانو کردنەوە ) دروست دەبێ . . لە هەمان کاتدا بێتو چەند ووشەیەکی تر بێنێ کە پەیوەندی‌یان بە ووشەکانی هەوەڵەوە هەبێتو یەکە یەکە پەیوەندی‌دارەکانیش دەست نیشـــان بکا ، بــە مـــەوەش ( دابەش کردن ) دروست دەبێ . . واتە ئەگونجێ کە لە یەك شوێن دا هۆنەر یا نووسەر چەند ووشەیەك بێنێو جــارێك ئەم ووشانــە بکاتەوەو جارێکی تریش چەند شتێکی تریان بەسەر دابەش بکا ، وەکو ئەم هۆنراوەی

پیرەمێرد کە دەڵێ :

بە جووت پەروانەو ماسی کە دڵدادەی چرا و گـوڵن
نزیکی ئەم ئەسووتێنێ ، لە دووری ناو ئەوان حۆڵن .

پەروانەو ماسی : ئەویان کەسەرداسەری شەوق و ڕۆناکی ئەمەیـان کە لە ناو ئاودا نەبێ ناژی ، یەکەمیان هەتا لەو کڕ ڕووناکی یە نزیك بێتەوە زووتر پەڕوباڵی هەڵدەکڕوزێ و دەبێتـە خۆڵەمێش ، دووەمیشـیان هەتا زووتر ئاوی لێ ببڕێ حۆڵ‌و کێژ تر دەبێ‌و دەخنکێ .

پیرەمێرد لە نیوەی یەکەم دووشـەی لە تەنیشت یەك هێنـــاوە ( پەروانە ـ ماسی ) ، ئەوەندەی پێ ناچێ دوو وشەی تر دێنێ ( چرا ـ گوڵ ) کە چراکە تیلەی پەروانەو گۆلەکـە دالدەی ماسی‌یە ، بەڵام ئەو ئەوەی دیار نەکردووە کە ( چرا ) پەیوەندی بە ( پەروانە ) و ( گۆل ) پەیوەندی بە ( ماسی ) یەوە هەیە ، چونکە لای مـۆگەر بووە کە خوێنەر خۆی ئەوەی لە باردا هەیە ئەو پەیوەندی‌یانە بدۆزێتەوەو هەر وشەیەك بۆ خاوەنەکەی بپاتەوە ، جا چونکە دیاری نەکردووە کامە بۆ کامە دەچێتەوە مانای وایە ( پێچان‌و کردنەوە ) لێرەدا هەیە ، وە لە بەر ئەوەی یەکەم وشە بۆ یەکەم ( چرا ـ پەروانە ) و دووەم وشە بـۆ دووەم ( گۆل ـ ماسی ) دەچێتەوە ، بۆیە ئەمەیان ( پێچان‌و کردنەوەی ڕێکـە ) . . ئەمە وا ، بەڵام لە نیوەی دووەم کاتێ کە پیرەمێرد دەڵێ « نزیکی ئەم ئەسووتێنێ لە دووری ناو ئەوان حۆڵن » ئەمە دابەش کردنە چونکە دیاری کردووە کە نزیك بوونەوە و سووتانەکە بۆ پەروانەیەو حۆڵ و لە نـــاو دوور کەوتنەوەکە بۆ ماسی‌یە . .

## — دوا سەرنج —

خوێنەری ئازیز :

وەك لە پێشەکی ئەم بەرگەو لە پێشەکی بەرگی یەکەمیش دا ئوتم ( رەوانبێژی ) بە هەر سێ بەرگییەوە بەرهەمی کردوکۆش و هەول و تەقەلای دوو سالی رەبەقە ( ١٩٦٨ — ١٩٦٩ ) . . بە هەزار ژان و ئازارو دەردەسەری‌و ئازو فیزی ئەم‌و ئـەو توانیم سالی ١٩٧٢ بەرگی یەکەم چاپ بکەم‌و ئەم سالیش وا بەرگی دووەمیم خستە بەر دەستەوە، خۆ ئەگەر کاری چاپ و چاپەمەنی کوردی وا بڕوا ، بڕوابکە بەرگی سێیەم دەبێ بە ( تەیری عونقاو شاری جابولقاو پلاوی خانقا . ) . .

دەمەوێ ئەوەش بلێم ئەو دوو بەرگەی تـا ئێستـا لە بن بـاری گرانی چاپ دا هاتوونەتە دەرێ ، کەلێ گۆڕان و کورت کردنەوەو پالاوتن‌و خەست کردنەوەیان بە سەر داهاتووەو وایان لێ هاتوە ئەو نرخ‌و تام‌و بۆیەیان نەماوە کە لە نوسخە ئەسلیەکەدا هەستی پێ دەکرا . . جارێ ئەگەر بەرگی یەکەمیم وەك خۆی چاپ بکردایە بەلانی کەمەوە دەگەیشتە ( ٣٠٠ ) لاپەرە ، کەچی پاش سێ جار کورت کردنەوەو لێ پچڕین تەنیا ( ١٠٠ ) لاپەرەکی لێ مایەوە . . ئەم بەرگەش هەروا ، دەستنووسە ئەسلیەکەی بگەیشتبوایە چاپ ( ٢٥٠ ) لاپەرەی پتر لێ دەردەچوو بەلام ئەعلەت لە ( چلکی دەست ) کە ناچاری کردوم سێ جار خەستی کەمەوەو سەدان نموونەو دەیان باسی ئێرەو لەوێ لێ فڕێ بدەم‌و لە ئەنجام‌دا هەر ئەوەندەی لێ مایەوە کە دەیبینی ، بۆیە نامەوێ باسی بەرگی سێیەمی هەر بکەم . .

کورد ئەلێ ( کوێر تا دەمری بە تەمای دوو چاوی ساغە ) ، منیش

تا دەمرم هەر بە تەمای چاپ کردنی بەرهەمە بۆ نـازە تۆزاوی‌یەکانم و داخی هەرە گەورەشم ئەوەیە کە باری چاپ و چاپکاری لە کوردستـان دا و ئـەرك گرانیشی لەولا بوەستێ ماوەی ئـەوەم بۆ ناهێلێتەوە کە بە دلی خۆم چاپیان بکەم‌و بەلانی کەمەوە مقەستیان لە بەر نەنێم و روویـــان لە لەکەی هەڵەی چاپدا خاوێن بکەمەوە . . . بەلام هەر کوردیشە گوتویە « دونیا بە هومێد خوراوە » . . . دەی ا با بزانین .

---

تێبینی :—

لە بەر ئەوەی هەر سێ بـــەرگی ئەم ( رەوانبێژی ) یە بـاسێکی یەکگرتووەو لە بەرگی یەکەمدا ناوی سەر چاوەکانم نوسیبوو و ئەگەر بۆم کرا بەرگی سێیەم چاپ بکەم لەوێش سەر چاوەکان دووبارە دەنوسمەوە و ئیدی بە پێویستم نەزانی لـــەم بەرگی دووەمەدا دووبارەی بکەمەوە . . . م

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |


• • •

• •

•

# ناواخن

Rhetoric

In Kurdish Liteature

V. II

By :

Aziz Gardi

دانەی بە ( ٤٠٠ ) فلسە

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی ٢٠٣ ـ ٣٠/٣/٩٧٥

چاپخانەی شارەوانی هەولێر ١٠٠٠/٩٧٦